عەلی وڕۆڵەکانی چەسپاوە، تاکۆتایی دنیا هەر ئاوا دەمێنێتەوە.[١]

لەکتێبی (عن أمیر المؤمنین علي بن أبي طالب)دا (بیروباوەڕی شیعە بۆ ئیمامەت)م لێکداوەتەوەو بێ بێوەرۆکی ئەم دەعوایەم دەرخستووە.

دووەم: بزووتنەوەی عبداللەی کوڕی زوبێر لەسەردەمی یەزیددا:

ئیبن زوبێر ﷺ بڕیاریدا بەیعەت بەیەزید نەداو بچێت لەمەککە ئام بگرێت.

**أ ـ هۆکارەکانی هەڵبژاردنی (مەککە):**

ژمارەیەك هۆکار وایان لەئیبن زوبێر کرد (مەککە) بەگونجاوترین شوێن دابنێ وبیکاتە پەناگاو ئارامگای خۆی: گرنگترینی ئەو هۆیانە:

١ ـ لەقۆناغی ئێستادا هەرێمی (مەککە) بەپێچەوانەی هەرێمەکانی تر لەبارترین هەرێمە بکرێتە پەناگا: (عێراق) بە هەردوك شارەکەیەوە (کوفەو بەسرە) دانیشتوانەکەیان جێگەی پشت پێ بەستن نین وبۆ دالدەدانی هەر سەرکردەیەکی بەرهەڵستکاری دەسەلاتی بەنی ئومەییە، ئەوەی بەسەر حوسێنیان هێنا باشترین بەلگەی ئەم قسەیە مانە، ئیبن زوبێر بەباشی لەمە حالی ببوو، ئەم حالی بوونەشی لەکاتی ئامۆژگاریەکانی دەردەکەوێت بۆ حوسێنی کوڕی عەلی، کاتێك پێی گوت: مەچۆ بۆ عێراق.[٢]

پێ ی گوت: بۆ کوێ دەچی؟! بۆ لای گەلێك باوکتیان کوشت وتانەو تەشەریان لەبراکەت دەدا؟!.

(میسرو یەمەن)یش: لە گۆڕەپانی ڕووداوەکان دوربوون، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە لەم دوو هەرێمەدا پشتیوان ولایەنگری ئیبن زوبێر دەست نەدەکەوتن.

(شام)یش ـ وەك زانراوە پایتەخت وقەلای ئومەویەکانە.

٢ ـ (مەککە) ـ بەهۆی بوونی ماڵی خودا لەوێدا ـ ولاتێکی حەرامەو دروست نیە خوێنرێژی تیدا بکرێت، ئەمە کەفیلە بۆ پاراستنی کەسانێك بیانەوێ بیکەنە

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ نسب قریش ص٢٣٩ للزبیري .

پەناگەی خۆیان وخۆی پێ لەکوشتن دەرباز بکەن، مەگەر کەسێك تاوانێکی وای کردبێ واجب بێ بکوژرێتەوە تیایدا، بیرکردنەوە لەبەکارهێنانی هێز بەلانی کەمەوە دەبێ وەك دواچارەسەر بکرێت بۆ ئەو حوکمە تایبەتیە.

٣ ـ (مەککە) ڕێزو حورمەت وپیرۆزی تایبەتی خۆی هەیە لەنێو دڵ ودەروونی موسڵمانانندا؛ لەبەر ئەوە هەرکەسێك بیەوێ بێ ڕێزی بەرامبەر بنوێنێ وزیانێکی پێ بگەیەنی ڕووبەڕووی بەر هەڵستکاریەکی توند دەبێتەوە لەلایەن تەواوی موسڵمانانەوە.

ئیبن زوبێر زۆری سوود لەم خاڵە وەرگرت.

٤ ـ ساڵانە لەوەرزی (حەج)دا هەزاران موسڵمان لەوڵاتە جۆراو جۆرەکاندا ڕوو لە(مەککە) دەکەن، کەدەتوانرێ لەم وەرزەدا ڕای گشتی کاری لەسەر بکرێت و ئاڕاستە بکرێت، ئەمەش جگە لەهەرێمێکی وەك (مەککە) لە هیچ هەرێمێکی تر دەستەبەر ناکرێت.

٥ ـ مەککە لەدوای کۆچی پێغەمبەری خوادﷺو هاوەڵانی، سیاسەت وحوکمڕانی تێدا نەگێڕدرا بوو، حوکمڕانی ئومەویش لەمەککەدا بێ هێز بوو.

٦ ـ لەکۆتاییدا: بزووتنەوەکەی ئیبن زوبێر پەیوەست بوو بەزۆرینەی خەڵکی مەدینە، کەهاو هەڵوێستی ئیبن زوبێر بوون لەدژایەتیکردنی حوکومەتی بەنی ئومەییە، کەواتە واگونجاوە ئیبن زوبێر لەمەدینە نزیك بێت وپشتیوانی دانیشتوانەکەشی بۆ خۆی مسۆگەر بکات و زوو زووش پەیوەندیان پێوە بکات.[١]

**ب ـ هۆکارەکانی دەرچوونی ئیبن زوبێر و هاوەڵانی:**

ئامانج لەدەرچوونی ئیبن زوبێرڕضي الله عنهو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ـ کە لەنێویاندا ژمارەیەك هاوەڵ وتابیعی هەبوون وەك (میسوەری کوڕی مەخرەمەو عبداللەی کوڕی سەفوان وموسعەبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف وژمارەیەکی تر

١ـ عبدالله بن الزبير والأمويون ص٧٠،٧١ عبدالله بن عثمان .

لەڕێزدارانی ئەو سەردەمە - گۆڕینی واقیع بوو بەشیر، واقیعێك كەخیلافەت وحوكمڕانی تێدا چوو بووە قۆناغی پاشایەتی ومیراتگری، هەواڵگەلێكی زۆریش دەربارەی یەزید بڵاو ببوونەوە كە ڕەنگوڕوی خەلیفەی ئومەویانی لەشام بەناشیرین نیشان دەدا.

لێرەدا پێویستە تێ بگەین: ئیبن زوبێر لەبەر خودا ڕاپەڕی، نەك بۆ شتێكی تر، خەڵكانێكی وەك (مەحەممەد ماهر حمادە) دەڵێن گوایە: لەگەڵ ئەوەدا بزووتنەوەكەی ئیبن زوبێر لەتێكەڵەیەكی چەند ڕەگەزی سەر سوڕهێنەر پێكهاتبوو، ئەوا هەوای كەڵلەو ڕق وكینەی دڵ هەڵی دەسوڕاند، كەلەكەسایەتی ودەروونی ئیبن زوبێردا خۆیان دەنواند.[1]

بێگومان ئامانجی بزووتنەوەكەی: گێڕانەوەی ئوممەت بوو بۆ ژیانی شوڕاو ڕاوێژو، لەلایەن باشترینی ئەندامەكانیەوە حوكمڕانی بكرێت، دەترسا جێنشینایەتی ببێتە پاشایەتی؛ بۆیە بەلایەوە بەكارهێنانی هێز لەلابردنی خراپەدا لەخودای نزیك دەكاتەوەو سنورێكیش بۆ گواستنەوەی سیستەمی جێنشینایەتی بەرەو سیستەمی پاشایەتی دادەنێت، هەر لەبەر ئەمە بوو تا (یەزید) نەمرد بانگەشەی بەیعەتی بۆ خۆی نەكرد.[2]

ئیبن زوبێر وتاری دەداو دەیگوت: سوێند بەخودا، جگە لە چاكسازی و هەستاندنەوەی هەق چی ترم ناوێ، من نامەوێ ماڵ كۆكەمەوەو بەسمەنەی بكەم.[3]

دەیگوت: خودایە گەیشتن بەتۆم پێخۆشە، تۆش گەیشتن بەمنت لاخۆش بێ، شەرم لەگەڵ دوژمنی تۆ كردووە، تۆش پاداشتی موجاهیدانم پێ ببەخشە[4]، عبداللەی كوڕی سەفوانی كوڕی ئومەییە بە ئیبن زوبێری دەگوت: وەڵڵاهی من بەهاوشانی تۆ نەجەنگاوم تەنها لەپێناوی دینەكەمدا نەبووبێ.[5]

---

١ـ الوثائق السياسية للجزيرة العربية ص١٨ .

٢ـ الطبقات (١٤٧/٥) .

٣ـ أنساب الأشراف (٣١٥/١) .

٤ـ تأريخ إبن عساكر، نقلاً عن عبدالله بن الزبير والأمويون ص٦٧ .

٥ـ أخبار مكة للفاكهي (٣٦٤/٢) .

لەمبارەوە گێڕانەوەی زۆرو ڕاست هەن، دەکرێ بیانکەینە بەڵگە بۆ هەقانیەتی بزووتنەوەکەی ئیبن زوبێر، لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی (مەدینە) پێیان وابوو ئەم بزووتنەوەیە جیهاد کردنە لەپێناوی خودادا.[1]

دەرچوونی حوسێنی کوڕی عەلی وعبداللەی کوڕی زوبێرو ئەهلی (حەڕڕە) ﷺ - لە پێناوی گێڕانەوەی شوڕادا بووە، بەپێ ی ئەم بەڵگە شەرعیانە:

١ ـ بەرگریکردن لەو مافەی خودا پێیداون:

٢ ـ زەوتکردنی حوکمڕانی خراپەو ستەمە وواجبە نەهێڵرێ.

٣ ـ دەستگرتن بەسوننەت و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان لەبواری خیلافەت و حوکمڕانیدا.[2]

چەند شتێك بوونە هاریکار بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی ئیبن زوبێرو کۆبوونەوەی خەڵك لەدەورەی، لەوانە:

کاردانەوەی کارەساتی کەربەلا، خراپنامەی مێژووی ژیانی یەزید، تالۆکە کردنی یەزید لەلابردنی والیەکانی وڵاتی حیجاز لەسەر پۆستەکانیان، حیجازێك کەمەڵبەندی قورسایی سیاسی بوو لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکان.[3]

**ج ــ هەوڵە ئاشتی یەکانی یەزید بۆ گێڕانەوەی ئیبن زوبێر:**

ئیبن زوبێر زۆری بەگوێ ی حوسێن دا خوێند تا دەرنەچێ بۆ کوفە، پێ ی گوت: بۆ کوێ دەچی؟! ، بۆ لای گەلێك دەڕۆی باوکتیان کوشت وبراکەتیان بەر تانەو تەشەر دەدا ؟!.[4]

ئەم هۆشداریەی دا بەحوسێن؛ چونکە هەستی پێکردبوو حوسێن دەکەوێتە حاڵەتێکی ترسناکەوە، دەشیزانی ئەگەر حوسێن لەعێراق تووشی لەنێو چوون ببێ،

---

١ـ عبدالله بن الزبير والأمويون ص٦٧ .

٢ـ الحرية أو الطوفان ص١٢٤،١٢٥ .

٣ـ عبدالله بن الزبير د.شحادة الناطور ص٩٦_٩٨ .

٤ـ مصنف بن أبي شيبة (١٥_١٩) بسند حسن .

ئەوا ئەنجامەکان بەدژی ئەو دەشکێنەوەو خۆی ـ واتە ئیبن زوبێر ـ لەمەیداندا تاك دەبێتەوەو بەئاسانی کۆتایی بەئەویش دەهێنرێ؛ لەبەر ئەمە زۆری هەوڵدا: حوسێن هەست بەگرنگی جێگەو پێگەو ڕێزو پایەی خۆی بکات ـ لەحیجازداو ـ ئەگەر لەمەککە بمێنێتەوە هەموو دانیشتوان لەسەرووی هەموشیانەوە ئیبن زوبێر قەدری تەواوی دەگرن وپشتیوانی دەکەن، بۆیە زۆر دلێرانەو بوێرانە ڕای خۆی بۆدەربڕی و گوتی:

ئەگەر دەتەوێ لێرەبی لێرە بمێنەوەو مەڕۆ، ببە براگەورەو ئەمیرمان، پشتگیری و هاریکاری تەواوت دەکەین، دڵسۆزیت بۆ دەنوێنین و بەیعەتت پێ دەدەین.[1]

دیارە ئیبن زوبێر لەڕوانگەی ئەوە: حوسێن خاوەن پلەو پایەو جێگای تایبەتە لای موسڵمانان ورێزو ستایشێکی بێ ئەندازەی هەیەو کەس لەم بوارەدا پێ ی ناگات؛ ئەوا دەیەوێت سەرکردایەتی گشتی بەدەست حوسێنەوە بێت، لەلایەکی ترەوە بەحوکمی ئەوەی خۆی خاوەن بەشێکی باشە لەبەشداریکردنی هێرشی سەربازی سەرکەوتوانەی گۆڕەپانی جیهادو فەتحی ئیسلامی، پێی باشە نەخشەو پیلانی ڕووبەڕوو بوونەوەی لەبەرامبەر یەزیدی کوڕی معاویە بەدەست خۆیەوە بێت.

ئیبن زوبێر پێی چاك بوو وڵاتی حیجاز بکاتە مەڵبەندی وەرچەرخان و پەلهاوێشتنی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری؛ چونکە دانیشتوانەکەی ڕاستگۆ ـ یەو خاوەن بەڵێنەو خودا پەرست وچاکە خوازەو زانایانی هاوەڵ وشوێنکەوتووە گەورەکانی لێن و، بوونی هەردوك حەرەمی (مەککەو مەدینە)ش ڕێزو پێگەی تایبەتی خۆیان لەنێو دڵو دەروونی موسڵماناندا هەیە، کەواتە ئەگەر دەسەڵاتی تەواویان بەسەر حیجازدا پەخشبوو، ئەوا بزووتنەوەکەیان چەندین هەنگاوی گەورە دەهاوێ بۆ هەرێمەکانی تری جیهانی ئیسلامی، کاتێکیش موسڵمانان بۆ حەج و عومرە هاتنە حیجاز بێگومان هەواڵی هەردوك بەرهەڵستکار (حوسێن وعبدالله)و چێگەو پێگەی ئاینی وسیاسی وکۆمەڵایەتی ئەوان دەگەیەنن بەخەڵکی

---

١ـ أنساب الأشراف (١٣/٤)، موافق المعارضة ص٥١٨ .

هەرێمەکانیان، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ سرنج ڕاکێشانی دانیشتوانی هەرێمەکان و زۆر بوونی پشتیوانانیان.

کاتێك حوسێن بەرەو کوفە ڕۆیشت ولەڕۆژی عاشوڕای ٦١ك لەکەربەلا کوژرا، ئەم کارەساتە کاریگەری گەورەی لەسەر ئیبن زوبێرو بزووتنەوەکەی دروستکرد، ئەو شتەی ئیبن زوبێر لێ ی دەترسا - لەخۆ تەنها کردنی ئومەویەکان بەئەووە - هاتەدی، پاشان ئەو کەسەی ڕێزو جێگەو پێگەی بۆ بزووتنەوەکە زۆر کردبوو کوژرا، لەگەڵ ئەمەشدا کەس ورتەی لێنەهات وبۆ حوسێن نەجۆشاو لەدژی ئومەویەکان ڕانەپەڕی.[1]

لەوانەیە ئەم تاکبوونەوەی ئیبن زوبێر لە گۆڕەپانی دژایەتی دا وای لەئیبن خەلدون کردبێ بڵێ: کەس لە دژایەتیکردنی ئەم پەیمانە - ی جەماوەری موسڵمانان لەسەری یەکدەنگ بوو- نەمایەوە جگە لەئیبن زوبێر، شاز بوونی بەرهەڵستکاریش شتێکی زانراوە.[2]

ئیبن زوبێر هەستی بەهەڵوێستە مەترسیدارەکەی کرد، بەڵام هەوڵیدا سوود لە هەموو ئەو ڕق وکینە وەربگرێت کە لەدڵ و دەروونی موسڵماناند لەدژی ئومەویەکان لەسوێ ی کوژرانی حوسێن پەنگی خواردۆتەوە.[3]

١ ـ یەکەمین هێرشی ڕاشکاوی ئیبن زوبێر لەدژی یەزید: ئەو کاتە بوو هەواڵی کوژرانی حوسێن ی بیست، هەستایە سەر پێ ولەنێو ئاپۆڕای جەماوەردا و تارێکی کاریگەری خوێندەوە، پەرۆشی خۆی بۆ حوسێن دەربڕی، سەرزەنشتی بکوژەکانی کردو گوتی: بەخوا کەسێکیان کوشتووە؟ شەونێژی زۆری هەبوو، ڕۆژگاری ژیانی بەڕۆژوو بوو، شایانتر بوو لەئەوانە بۆ حوکمڕانی، لەپێش ئەوەوە - یەزید - بوو لە دینداری وچاکەدا، قەسەم بەخوا: قورئانخوێندنی بەگۆرانیگوتن و گریان لەترسی خودای بە بالۆرەو حەیران وبەڕۆژوو بوونی بەخواردنەوەی خەمر

١ـ موافق المعارضة ص٥١٩ .
٢ـ مقدمة إبن خلدون (٤٦٥/١) .
٣ـ موافق المعارضة ص٥٢٠ .

نەگۆڕیبۆوە، لەجیاتی دانیشتن لەکۆڕی زیکر نەدەچووە دەشت ودەرو خۆی هەڵباویَ بۆ نێچیر فسوق یلقون غیاً.[1]

هەست وسۆزو پەرۆ شبوونی زۆری خەڵکی حیجاز بەگشتی بۆ حوسێن ﷺ پاڵی پێوەنان بەیعەت بەئیبن زوبێر بدەن[2]، ئیبن زوبێر تێبینی کرد دانیشتوانی حیجاز دڵ ودەرونیان پڕبووە لەداخ و ڕەق وکینە ـ لەدژی ئومەویەکان ـ بەهۆی کوژرانی حوسێن ﷺ لەلایەن ئەوانەوە؛ بۆیە بانگی خەڵکی دەکرد بۆ حوکمەتی شورا، ڕەخنەی لەیەزید دەگرت وقسەی پێ دەگوت[3]، دەیگوت: (یەزید دەخواتەوە)، خەڵکی لێ سارد دەکردەوە، کۆبوونەوەی بەخەڵکی دەکردو بەدوور ودرێژی خراپەکانی (بەنی ئومەییە)ی بۆ باس دەکردن.س[4]

٢ ـ هەوڵە ئاشتی یەکانی یەزید: یەزید لەسەرەتادا نەیویست کارێك بکات کێشە لەگەڵ ئیبن زوبێر بکات؛ لەو پێناوەدا نامەیەکی بۆ نارد، کە لە نێویدا پەرێزو شوێنەواری کردەوە چاکەکانی بۆ دەخاتە ڕوو، کە لەئیسلامەتیدا ئەنجامیداون، ئینجا ئاگاداری دەکات لەهەڵایساندنی فتیلەی فیتنەو ئاژاوە، بەشێکی نامەکە ئاوایە: خودات وە بیر دەخەمەوەو، بەخۆت دابچۆوە، تۆ یەکێکی لەپیاوە بەتەمەنەکانی قورەیش، مێژوو وپێشینەیەکی باشت هەیە لەکردەوەی جوانداو، چەندین هەنگاوی ڕاست ودروستت لەبواری پەرستن و فتوادا هەڵێناون، لەکردەوە جوانەکانی پێشدات زیاد بکە، کارێك مەکە کارەکانی پێشداشت بباتەوە هیچە، وەرە نێو ئەو بازنەی خەڵك هاتۆتە نێویەوە، خەڵك بەرەو ئاژاوە مەبە، حەرامی خودا حەڵاڵ مەکە، ئەویش بەیعەتی پێ نەدا.[5]

٣ ـ یەزید لەکوڕی زوبێر تورە بوو: ئیبن زوبێر وەڵامی بانگەشەکەی یەزیدی نەدایەوەو بەیعەتی نەدایە، بۆیە یەزید سوێندی خوارد نابێ بەیعەتی ئیبن زوبێر

---

١ـ موافق المعارضة ص٥٢٠ .

٢ـ أنساب الأشراف (٣٠٤/٤) .

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ أخبار مكة (٢٠١/١)، بسند كل رجاله ثقات .

٥ـ أنساب الأشراف (٣٠٤،٣٠٣/٤) .

قبولّ بکات تابە کۆت وزنجیرکراوی بۆلای نەهێنن.[١]

معاویەی کوڕی یەزید زۆری هەولّدا بابی سوێندەکە بشکێنێ، چونکە ئیبن زوبێری دەناسی، کەقبولّ ناکات بەکۆت وپێوەندەوە بێتە لای یەزید، معاویەی کوڕی یەزید: پیاوێکی باش و لەخواترس وخۆبە کەمزان و ئاشتیخوازو تەبا بوو ودەترسا خوێنی موسلّمانان بەدەستی یەکتر برژێ، (عبداللەی کوڕی جەعفەر) لەم بارەوە هاوکاری معاویەی کرد، بەلاّم یەزید لەسەر ڕایەکەی خۆی سوور بوو.

معاویەی کوڕی یەزید لەپێناوی خاوبوونەوەی یەزیدی بابی لەهەلّوێستە توندەکەی، هەستا دەکەسی لەپیاو ماقولاّنی ولاّتی شام بەوەفد ناردە لای ئیبن زوبێر بەکۆتو پێوەندێکی زیوو وپۆشاکێکی بالاّ پۆشی چنراو لەخوری وئاوریشم.[٢]

لەگێڕانەویەکی تردا: یەزید زنجیرێکی زیوو کەلەپچەیەکی زێڕو پێوەندێکی زیوی بۆ ئیبن زوبێر نارد.[٣]

وەفدەکە گەیشتە (مکة)، ئیبن عوزاتی ئەشعەری دەستی بەقسە کردو گوتی: ئەی ئەبو بەکر! هەرچەند بەرێزی کردەوەجوانەکانت لەبەر چاوە؛ لەکاتی پشتیوانیت لەخەلیفەی ستەملێکراو لەڕۆژانی دەورە درانی داو ئەم هەلّوێستەت قابیلی فەرامۆش کردن نیە، بەلاّم یەزیدی ئەمیری ئیمانداران تووڕە بووە لەبەرامبەر وەلاّم نەدانەوەی نوعمانی کوڕی بەشیری نوێنەری بۆ بەیعەتدان، سوێندی خواردووە دەبێ بەکۆتوو پێوەندێکی سووکەوە بێیتە لای وسوێندەکەی بەرەسەر، پۆشاکێکی بەسەر دابکەو کەس کۆت و پێوەندەکە نابینێ، بزانە تۆ تاکە کەسێکی بەرزو بەرێزی لەلایەن ئەمیری ئیماندارانەوە داواکراوی، کەبە هیچ شێوەیەك ڕکابەری ئەو ناکرێت نەلە سەرداری وپایەداری، نە لەمالّ و پارەداری دا.[٤]

٤ ـ ئیبن زوبێر بیردەکاتەوەو ڕاوێژ دەکات: ئیبن زوبێر مۆلّەتی چەند ڕۆژێکی لەوەفدەکە خواست تا بیربکاتەوەو ڕاوێژ بکات، چووە لای ئەسمائی دایکی و

---

١ـ أنساب الأشراف (٣٠٤/٤)، أخبار مكة (٣٥١/٢) إسناده حسن .
٢ـ تأريخ خليفة ص٢٥١ إسناده حسن، موافق المعارضة ص٥٢١ .
٣ـ الأحاد والمثاني (٤١٦/١) بسند صحيح لبن آبي عاصم .
٤ـ أنساب الأشراف (٣٠٨/٤)، موافق المعارضة ص ٥٢٣ .

داواکەی یەزیدی بۆ خستە ڕوو، گوتی: ڕۆڵەگیان بەڕێزو حورمەتەوە بژی وبەڕێزو حورمەتەوە بمرە، خۆت مەخە دەست(بەنی ئومەییە)و گاڵتەت پێ بکەن، مردن لەم حاڵە باشتر.[1]

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، مەڕوانی کوڕی حەکەم عبدالعزیزی کوڕی بۆلای ئیبن زوبێر ناردو گوتی: پێ ی بڵێ: بابم لەپێناوی گرنگیدان بەتۆو پاراستنی ڕێزو حورمەتت منی بۆلای تۆ ناردووە، سوێندەکەی ئەمیری ئیمانداران بەرەسەر، تەنها کۆتو پێوەندێکی سادەت تێوە دەپێچرێت و پۆشاکێکی سەرتاپای بەسەردا هەڵکێشە، نابینرێت وکەمێك زرینگەی لێوە دێت، ئیبن زوبێر سوپاسنامەیەکی بۆ مەڕوان ناردەوە.[2]

ئینجا وەڵامی وەفدەکەی بەنەرێ دایەوە.[3]

٥ ـــ هەڕەشەی وەفد لەئیبن زوبێر و وەڵامدانەوەی: دوای وەڵامدانەوەی وەفدەکە بەنەخێر، ئیبن زوبێر ڕووبەڕووی ئیبن عوزاتی سەرۆکی وەفدەکە گوتی: وێنەی من وێنەی کۆترێکی کۆترەکانی حەرەمە، ئایا تۆ ئامادەی کۆترێك لەکۆترەکانی حەرەم بکوژێ ؟

گوتی: بەڵی، ڕێزی کۆتری حەرەم چەندە؟ هاکوڕە: تیرو کەوانەکەم بۆ بێنە، بۆی هێنا، تیرێکی خستە نێو چەقی کەوانەوە، ئینجا بەرەو کۆترێکی حەرەم ڕاستا، گوتی: هۆ کۆتر: یەزید شەڕاب دەخواتەوە؟ بڵێ(بەڵێ)، بەخوا ئەگەر وابڵێ ی تیرەکەت تێ دەگرم!، هۆ کۆتر: یەزیدی کوڕی معاویە لەخەلیفایەتی دەخەی و لەئوممەتی محمدﷺ جودا دەبیتەوەو لەحەرەم جێنشین دەبی تاخوێنت حەڵاڵکەی؟، بەخوا ئەگەر وابکەی تیرت تێدەگرم.

ئیبن زوبێر گوتی: هاوار بۆ تۆ! باڵندە قسە دەکا؟ گوتی: نا، بەڵام خۆ تۆ قسە دەکەی، سوێند بێ بەخوا بەخۆشی بێ یان بەناخۆشی دەبێ بەیعەت بدەی، دەنا

---

١ــ أخبار مكة(١/٢٠١) بسند كل رجاله ثقات .

٢ــ نسب قريش ص٤٤٩، موافق المعارضة ص٥٢٤ .

٣ــ موافق المعارضة ص٥٢٤ .

ئالای ئەشعەریەکان لەم دۆڵ و دەشتە بەشکاوەیی دەبینی، ئەگەر بڕیارماندا شەڕت لەگەڵ بکەین، تۆش چویە نێو(کەعبە)وە یان بەسەرتیدا دەڕوخێنین یان دەیسوتێنین ئیبن زوبێر گوتی: ئایا حەرەمی بەیتو لحەرام حەلاڵ دەکەی؟ گوتی: ئەو کەسە حەلاڵی دەکات لەنێویدایەو لەهەق لادەدات وستەم دەکات.[١]

ئیبن زوبێر گوتی: بەیعەتی یەزیدم لەئەستۆ دانیە ئیبن عوزات گوتی: هۆ هۆزی قورەیش، گوێتان لێبوو چی گوت، خۆ ئێوە بەیعەتتان داوە، ئەوە فەرمانتان پێ دەکا پاشگەز ببنەوە.[٢]

ئیبن زوبێر باسی ئەنگی وکەمو کوڕیەکانی یەزیدی کردو گوتی: بەیانی هەڵدەستێ سەرخۆشە، ئێوارە دەیبینی سەرخۆشە، ئینجا گوتی: ئەی ئیبن عوزات: من قەت بە ترسنۆکی لەخەو هەڵنەستاوم، من بەڕۆشنایی ورێنمایی پەروەردگارم بەڕێگادا دەڕۆم، من بکوژرێم باشترە لەوەی تۆ دەیڵێ ی، ئەگەر بەمردنی ئاسایش مردم: خودا چاك دەزانێ چەندەم پێناخۆشە گوناهو تاوان لەسەر زەوی ئەودا ئەنجام دەدرێن خەڵکەکەی تریش وەکو ئیبن زوبێر وەلامی وەفدەکەیان دایەوە.[٣]

ئینجا ئیبن زوبێر گوتی: خودایە من پەنابەری ماڵەکەتم[٤] ناسناوی خۆی بە(عائذ اللـه) واتە پەنابەری خودا دەرکرد[٥]، بۆیە دوای ئەمە بە(عائذ) پەنابەر بەناوبانگ بوو.[٦]

د ـ هەوڵە جەنگیەکان لەدژی ئیبن زوبێر:

**١ ـ هێرشی عەمری کوڕی زوبێر:**

یەزید بڕیاریدا دەبێ هێرشێکی سەربازی بکرێتە سەر ئیبن زوبێرو یەکێك لەم دوو ئامانجەی بپێکێ: کوژرن ولەنێو بردنی، یان بگیرێت وبەکۆت وزنجیر کراوی

---

١ـ أنساب الأشراف (٣٠٩/٤) .
٢ـ عيون الأخبار (١٩٦/١) .
٣ـ أنساب الأشراف (٣٠٩/٤) .
٤ـ موافق المعارضة ص٥٢٥، نقلاً عن إبن عساكر .
٥ـ الإصابة (٤٩/٤) سند صحيح .
٦ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن موافق المعارضة ص٥٢٥ .

وملبەستراوی بهێنرێت وسوێندەکەی بچێتە سەر.

لەم ساڵەدا ـ کەڕاست وایە ٦١ کۆچی بووبێ ـ (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی والی مەدینە حەجی کرد، ئیبن زوبێریش حەجی کرد، بەڵام نەنوێژی لەدوای (عەمره)وەو کرد، نە لە(عەرەفە)ش بەدوای کەوت.[1]

ئیبن زوبێر بەم هەڵوێستەی نیشانیدا: کەدان بەم دەوڵەتەدا ناهێنێت ولێ ی جودایەو سەر بەخۆیە؛ چونکە ڕاپەڕاندنی مەناسیکی(حەج) وەك ڕاپەڕاندنی کاروباری جیهاد دەبێ دەوڵەتی شەرعی ڕاپەڕێنێ، کەئیبن زوبێر مەناسیکی حەج بەپێشەوایەتی کاربەدەستی خەلیفە ئەنجام نادات، واتایی ئەوەیە دەوڵەتەکە ناشەرعی یە.[2]

پاش ئەمە ئیبن زوبێر (حاریسی کوڕی خالیدی مەخرومی)ی جێگری عەمری کوڕی سەعیدی لەمەککە قەدەغەکرد پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات لەحەرەمدا.[3]

ئەو سەر بەخۆیانە هەڵسوکەوتی دەنواندو، بۆ دەرکردنی بڕیارو فەرمانیش ڕاوێژی بە(میسوەری کوڕی مەخرەمە)[4] و (موسعەبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) و (حەبیری کوڕی شەیبە) و(عبداللەی کوڕی سەفوانی ئومەییە) دەکرد، وای پێنیشاندەدات کە کاروبار لەنێویاندا بەڕاوێژە، سەرپەرشتی وئیمامەتی نوێژەکانی و هەینیەکان وڕاپەڕاندنی مەناسیکی حەجی پێ دەکردن.[5]

یەزید نامەیەکی بۆ عەمری کوڕی سەعید نارد، فەرمانی پێکردبوو: هێزێکی سەربازی هێرشبەر ساز بکات، ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێکردو (عەمری کوڕی زوبێر)ی کردە فەرماندەی سوپاکە، جێی باسە (عەمری کوڕی زوبێر) سەرۆکی دەزگای ئەمنی مەدینە بوو، دژایەتی توندی (عبدالله)ی برای دەکرد، لایەنگران و هاوسۆزانی ئەوی دەگرت وبەرشەلاقی دەدان، لەو کەسانەی عەمر شەللاقی لێدوان:

---

١ـ أنساب الأشراف (٤/٤٠٧) .

٢ـ موافق المعارضة ص٥٢٦ .

٣ـ تأريخ إبن عساكر (٣٠/٢٠٠) .

٤ـ التقريب ٥٣٣ .

٥ـ تأريخ إبن عساكر (٣٠/٢٠٠)، موافق المعارضة ص٥٢٧ .

(مونزیری کوڕی زوبێر، محمدی کوڕی مونزیری کوڕی زوبێر، عبدالرحمن ی کوڕی ئەسوەری کوڕی عەبد یەغوس[١]، عوسمانی کوڕی عبداللەی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزام[٢]، خوبەیبی کوڕی عبداللەی کوڕی زوبێر.[٣]

ژمارەیەکیش لەترسی عەمر مەدینەیان بەجێهێشت و بەرەو مەککە ڕۆیشتن و خۆیان گەیاندە ئیبن زوبێر، لەو پەنابەرانە: عبدالرحمن ی کوڕی عوسمان و عبدالرحمن ی کوڕی عەمری کوڕی سوهەیل.[٤]

دەڵێن (عەمری کوڕی زوبێر) بۆ خۆی داوای کردووە سەرکردایەتیکردنی سوپا هێرشبەرەکەی بخرێتە ئەستۆ[٥]، سوپاکە ڕێکخراو، لەهەزار کەس پێکهاتبوو وبەرەو مەککە ملی لێنا، عەمر ئەنیسی کوڕی عەمری کوڕی ئەسلەمی بەحەوتسەد سەربازەوە بەرەو باری پێشەوە بەڕێکرد[٦]، ئەنیس و هێزەکەی لە(ذي طوى) جێگیر بوو، عەمری کوڕی زوبێریش لەگەڵ باقی سوپاکە ڕۆیشت تا گەیشتە (الأبطح).[٧]

عەمر نوێنەری خۆی ناردە لای ئیبن زوبێرو داوای لێکرد سوێندەکەی یەزید بباتە سەرو کارێك نەکات شەڕو ئاژاوە لەوڵاتی حەرەمدا دروست ببێ.[٨] لەماوەی گفتوگۆدا عەمری کوڕی زوبێر لەسەربازگەکەی دەهاتە دەرەوەو لەمزگەوتی حەرەمدا پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکردو عبداللەی براشی لەدوای ئەوەوە نوێژی دەکرد! عبدالله پیاسەی لەگەڵ عەمر دەکردو بەگفتوگۆی نەرم وشیرین دەیدواندو پێ ی دەگوت: من گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خودام، بەڵام تۆ کار بۆ یەزید دەکەی!، نوێژت بەدوا دەکەم وناکۆك نیم لەگەڵت، بەڵام: لەوەدا (گەردنبەندم لەمل کەیت و بەرەو شامم بەڕێبکەی)، بەقسەت ناکەم، چونکە بیرم لێکردۆتەوە و گەیشتومە

---

١ـ نسب قريش ص٢١٤،٢١٥ .

٢ـ هەمان سەرچاوە ص٢٢٣ .

٣ـ هەمان سەرچاوە ص٢٣٩،٢٤٠ .

٤ـ الطبقات (٥/١٥٨) .

٥ـ أنساب الأشراف (٤/٣١٢)، مواقف المعارضة ص٥٢٨ .

٦ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن مواقف المعارضة ص٨٢٥ .

٧ـ (الأبطح):

٨ـ تأريخ الأسلام (حوادث ٦١_٨٠) ص١٩٩ .

ئەنجامێك، كە نەحەڵاڵە و نەدروستە خۆم بەدەستەوە دەم و خۆم تووشی داماوی و سەرشۆڕی بكەم، بۆلای سەرۆكەكەت بگەڕێوەو ڕای منی بۆی بنووسە بەڵام عەمر نەهاتە ژێرباری عبداللەو نامەی بۆ یەزید نەنووسی؛ بەبەهانەی ئەوەی كە ئەهاتووە فەرمانێكی سنوردار كراوی ئەو جێبەجێ دەكات.

دوای كۆتاییهاتنی ماوەی گفتوگۆ: ئیبن زوبێر، عبداللەی كوڕی سەفوانی جەمەحی بەپۆلێك سەربازەوە ناردو، لای خوارەوەی (مەككە)یان گرت و، نەغافڵ گەمارۆی هێزەكەی (ئەنیسی كوڕی عەمری سەلەمی)یان داو ئەنیس كوژراو، هێزەكەشی تێكشكا.

لەهەمان كاتدا: (موسعەبی كوڕی عبدالرحمن ی كوڕی عەوف) سەركردایەتی هێرشێكی كرد بۆسەر سەربازگەكەی (عەمری كوڕی زوبێر) لە(ئەبتەح) دەرەنجام هێزەكەی عەمرشكا، خودی عەمریش خۆی بەماڵی (عەلقەمە)دا كرد، عوبێدەی كوڕی زوبێر هاتە لای ولەگەڵ خۆی بردو پەنایدا، ئینجا بۆ لای (عبداللە)ی بردو گوتی: كە پەنامداوە، عبداللە گوتی: بەڵێ، سەبارەت بەمافی خۆم لەپەنادایە، بەڵام تۆڵەی ئەو كەسانەی لێ دەكەمەوە كەلە (مەدینە) ئازاری داون.[١]

عبداللە عەمری برای بەپێوە ڕاگرت، بانگی بەندكراوو سزادراوانی كرد تۆڵەی لێ بسێننەوە، هەركەسێك بهاتبایە دەبوایە شێوەی سزاكەی باس بكردبایە، عبداللە پێ ی دەگوت: چی بەسەر هێناوی ئاوای بەسەر بهێنەوە، سەرچاوەكان دەڵێن: عەمر ڕووبەڕووی لێدوانێكی زۆر بۆوەو هەر لەژێر ئەو لێدوانەشدا مرد.[٢]

ئەنجامی ئەم هێرشە بەسەركەوتنی ئیبن زوبێرو بزوتنەوەكەی تەواو بوو، ئیبن زوبێر زیرەكی ولێزانی خۆی سەلماندو توانی كێشەكە بەباری بەرژەوەندی خۆیدا ئاوەژوو بكاتەوە، ئەو لەسەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەكەیدا بڵاوی دەكردەوە: ئەو بەیعەتەی ـ لەلایەن معاویەوە ـ بۆ یەزید دانراوە ڕەزامەندی وڕای گشتی موسڵمانانی لەسەر وەرنەگیراوە، دەبێ بۆ كارێكی ئاوا پرس وەرگیرێ؛ بۆیە

١ـ الطبقات (١٨٥/٥)، أنساب الأشراف (٣٠١٢/٤) .
٢ـ أنساب الأشراف (٣١٦/٤)، تأريخ الاسلام حوادث سنة ٦١ هـ .

بانگەشەی بۆ (شورا) دەکرد، تادوو ساڵیش لەتەمەنی بزوتنەوەکە ڕابووڕا، هیچ کۆڕانکاریەك بەسەر دەسەڵات وهەیمەنەتی دەوڵتی (ئومەوی)دا نەهات، نەلە حیجاز نەلە هەرێمەکانی تر، بەڵام ئیبن زوبێر لەڕێ ی باسکردنی سیفەتە بەدەکانی یەزید ویستی جموجۆڵێك دژبە یەزید لەنێو خۆی بنەماڵەی ئومەویدا دروست بکات ودەرەنجام ئەوکەسە نەشیاوە لەپۆستی خیلافەت وازبێنێ.

یەزید بەو سوێندەی کەدەبێ ئیبن زوبێر بەکۆتوبەندەوە بەیعەت بدات کەوتە تەڵەی هەڵەیەکی گەورەوە؛ چونکە ناچێتە مێشکی هیچ کەسێکی ژیرەوە هاوەڵێکی ڕێزداری شەست ساڵە سەر بۆ داوایەکی ئاوای وەك یەزید دانەنوێنێ.

ئیبن زوبێر توانی کردارەکانی یەزید بەتایبەتی ئەم پەلامارە سەربازیەی بکاتە شایەت و بەڵگە لەبەر چاوی دانیشتوانی حیجاز، کە یەزید پیاوێکی خۆسەپێنەو شیاوی سەرکردایەتیکردنی موسڵمانانی نیە.

هەروەها ئەم ڕووداوە نیشانیدا: ئیبن زوبێر خاوەن مافێکی ڕەوایەو ڕووبەڕووی خەلیفەیەکی ستەمکاری وابۆتەوە، کەسواری ئەسپی بڕیارە تاکڕەویەکانی خۆی بووە.

هەڵوێستە توندوتیژەکانی عەمری کوڕی سەعیدی والی مەدینە هۆیەکی تر بوو بۆ خۆشەویست بوونی و ئیبن زوبێر لەلایەن خەڵکی حیجازو بەهێز تربوونی بزووتنەوەکەی دەگێڕنەوە: ئەم والیە لەگەڵ دانیشتوانی مەدینە تووڕەو توند بووەو خۆی بەزان بو و گوێ ی بۆ ئامۆژگاری ئەوان نە دەگرت.[١]

گێڕانەوەکان دەربارەی (عەمری کوڕی زوبێر)ی سەرۆکی دەزگای پۆلیسی مەدینە وسەرکردەی سوپا پەلاماردەرەکەش دەڵێن: عەمر خۆ بەزل زان وخۆ پێ شایی وستەمکار بووە، بیزانیایە کەسێك لایەنگری (عبداللە)ی برایەتی بەندی دەکردو بەر قامچی دەدا، دەگوترا: عەمر تورەیەو قسەی لەگەڵ ناکرێت، کەسێك بیدواندیانە پەشێمان دەبۆوە.[٢]

---

١ـ الموفقيات الزبير بن بكار ص١٥٢، نقلاً عن موافق المعارضة ص٥٣١ .

٢ـ أنساب الأشراف (٣١١/٤)، مواقف المعارضة ص٥٣١ .

ئەم پەلامارە سەربازیەی یەزید بەعەمری ئەنجامدا بۆ داگیرکردنی (مەککە) هەڵەیەکی یەکجار گەورە بوو؛ بۆیە ئیبن زوبێر توانی کاردانەوەی هەڵەکە لەلایەن جەماوەری حیجازەو بخاتە سەر حیسابی بەرژەوەندی بزووتنەوەکەی.

ئەم پەلامارە نواندنی بێ ڕێزی بوو لەبەرامبەر (مەککە) ،(مەککە)یەك کە لەسەردەمی نەفامی دا ڕێزو تایبەتمەندی خۆی هەبوو وئیسلام هات وڕێزو پیرۆزی زێدەتری بۆ بڕیاردا.

کاتێك عەمری کوڕی سەعید بووە والی (مەدینە) چووە سەر مینبەر و هەست و نەستی خەڵکی مەدینەی وروژاند بەقسەکانی، دەربارەی ئیبن زوبێر گوتی: خۆی لە(مەککە) پەناداوە، سوێند بەخودا داگیری دەکەین، ئەگەر بچێتەوە نێو (کەعبە)وە بەکوێرایی هەموو ناحەزێکو بەسەریدا دەسوتێنین.[١]

کاتێك سوپاکە ساز کرا، کۆمەڵێك هاوەڵ چوونە لای عەمرو زۆریان باسی حورمەت وڕێزو پیرۆزی مەککەو بەیتولحەڕام بۆ کرد چەندین ئایەت وفەرموودەیان بەبەڵگە بۆ هێنایەوە، پێیان گوت پەشیمان بێتەوە لەهێرشەکەی، بەڵام نەچووە مێشکیەوەو سوپاکەی بەڕێکرد.[٢]

مەڕوانی کوڕی حەکەمی - پیاوی دنیادیدەو سیاسی - بەعەمری گوت: مەککە داگیرمەکە، لەخودا بترسەو ڕێزو حورمەتی ماڵی خودا مەشکێنە، لەکوڕی زوبێر گەڕێن؛ پیربووەو تەمەنی لەشەست دایە، ئەو پیاوێکی بەئەزموون ودامەزراوو وخاوەن عەزم وئیرادەیە، لەڕای خۆی دانابەزێ وپشتی بەکەس لەهەرد نادرێ، بەخوا ئەگەر نەشیکوژن - هێندەی نەماوە - بۆ خۆی - بەمردنی ئاسایی - دەمرێ.

عەمر پێی گوت: بەخوا شەڕی لەگەڵ دەکەین ولەنێو (کەعبە)دا بەگژیدا دەچین، بالوتبەرزان لوتیان بشکێ، مەڕوان گوتی: وەڵڵاهی من ئەم پەلامارەم پێ ناخۆشە.[٣]

---

١- تأريخ خليفة ص٢٣٣ .

٢- أنساب الأشراف (٣١٢/٤)، مواقف المعارضة ص٥٣٢ .

٣- هەمان سەرچاوە (٣١٣/٤) .

(ئیبن زوبێر) ناسناوی (پەنابەری خودا)ی بەسەر خۆیدا بڕی، کەناسناوێکی کاریگەر بوو، دەستدرێژی بۆ سەر حەرەمی مەککەو پەنابەرانی کارێکە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان پێ ی قایل نابن، کەواتە بەرەنگار بوونەوەی سوپایەك، کە دەیەوێ حورمەتی حەرەم بشکێنێ واجبی سەرشانی موسڵمانانە، ئەگەر کەسێك توانای بەرگریکردنیشی نەبێت دەبێت لەمەولا هاوسۆزو لایەنگری بەرگریکارانی ماڵی خودا بێت ولەگەڵ عبداللەی کوڕی زوبێر بێت.[١]

بەڵێ کار بەوە گەیشت چۆن ئیبن زوبێر بەرگری دەکر خەڵکیش بەگشتی لەلای (طائف)ەوە بەرگری یان لەمەککە دەکرد.[٢]

ئەم پشتیوانی وهەست وسۆزەی دانیشتوانی حیجاز خستیانە قالبی کردارەوە بۆ ئیبن زوبێر، بووە مایەی بەهێزتر بوونی بزوتنەوەکەی وفراوانتر بوونی دەسەڵاتی ئەو، هەر ئەمەش بووە هۆکاری سەرکەوتنێکی ئاسان وکەمزیانی ئیبن زوبێر بەسەر عەمری کوڕی زوبێرو سوپا هەزار کەسیەکەیدا.[٣]

**٢ ـ هێرشی حەسین کوڕی نەمیرو گەمارۆدانی ئیبن زوبێر وسوتانی (کەعبە):**

ئەم هێرشە سەربازیە لەشام ڕێکخرا، سەرکردەکەی (موسلیمی کوڕی عەقەبەی نەمیری) بوو، (موسلیم)لە ڕێگادا مرد، (حەسین کوڕی نەمیری سکونی) بوو بە سەرکردە، چوار ڕۆژ لەمانگی موحەڕڕەم مابوون گەیشتە (مەککە)و سوپاکەی لە(حەجون)[٤]ەوە تا (بیری مەیمون)[٥] دامەزرا، کەسنوورێکی دوورو درێژە، هۆی ئەم کارەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر سروشتی شەڕ لە(مەککە) کە بەمشێوە پێچ دەخواتەوە.

ئیبن زوبێر هەستاو دەستی کرد بەهاندانی خەڵك بۆ بەرپەچدانەوەی سوپاکەی شام وپاراستنی بەیتوڵڵاە، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکانی ڕزگار بوو لە ڕوداوی (الحرة)ی

---

١ـ مواقف المعارضة ص٥٣٢ .

٢ـ أنساب الأشراف (٣١٢/٤) .

٣ـ مواقف المعارضة ص٥٣٣ .

٤ـ (حجون): چیایەکی بەرزە میلونیوێك لە(حەرەم) دوورە .

٥ـ (بئر میمون): بیرێکە مەیمونی کوڕی حەزرەمی هەڵی کەندووە .

مەدینـە هاتنـە پـاڵ سـوپاکەی ئـیبن زوبێـر، هـەروەها (نەجـدەی کـوڕی عـامیری حەنەفی) بەسەرکردایەتی خەڵکانێکی (خەواریج) هاتن پارێزگاری لەمەککە بکەن.[1]

جێی باسە هێرش و بەرەنگاری دەستی پێکرد، بەڵام ژمارەی جەنگاوەرانی گەڵ ئیبن زوبێر کەمتر بوون لەو جەنگاوەرانەی بەشداری جەنگی (الحرة)یان کرد، هەروەها سوپای شام بەبەراورد لەگەڵ سوپاکەی ئیبن زوبێر لەڕووی ژمارەو چەکو چۆڵەوە زۆرترو زیاتر بوو؛ بۆیە لەگەرمەی جەنگدا باری بەرژەوەندی بەلای (حەسین ی کوڕی نەمیردا) کەوت، ئەمەش بەهۆ ئەوە ئیبن زوبێر باشترینی هاوەڵانی بوونە دەستە چیلەی ئاگری شەڕەکە، وەك: هەردوك براکەی(مونزیرو ئەبوبەکری) کوڕانی زوبێرو (موسعەبی کوڕی عبدالرحمن) و (حوزافەی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوام) و (عەمری کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر).[2]

دوای ٣/ڕەبیعی یەکەمی /٦٤ك (حەسینی کوڕی نەمیر) مەنجەنیقی لەسەر کێوی (ئەبوقوبەیس)[3] وکێوی (قەیقەعان)[4] دامەزراند، (میسوەری کوڕی مەخرەمە)ی گەورە ڕاوێژکاری (ئیبن زوبێر) بەهۆ پێکرانی بەبەردێکی مەنجەنیق کوژرا، بەمەش گەورەترین هاریکاری لەدەستچوو، شەڕ درێژەی کێشا لەدەورەی مزگەوتی حەڕام پێچی خواردەوە جێگەو شوێنەکانی ئیبن زوبێر دەرکەوتن، دوای ئەوەی سەنگەرەکانی پێشەوەی لە(ئەبتەخ)[5] لەدەستدان، جگە لە (مزگەوتی حەڕام) و (حیجری ئیسماعیل) شوێنێکی تری بەدەستەوە نەما خۆی تێدا مەڵاس بدات.[6]

لە ئەنجامی حەڵاڵکرانی شەڕ لەوڵاتی (حەرەم) کەخودا (جلالە)و پێغەمبەرﷺ شەڕیان تێدا حەرام کردووە، موسیبەتی (سوتانی کەعبە) ڕوویدا.[7]

---

١ـ أنساب الأشراف (٣٣٨/٤)، مواقف المعارضة ص ٥٤٥ .
٢ـ جمهرة نسب قريش ص٣٦٢ .
٣ـ (جبل أبي قبيس) :
٤ـ (قیقعان): چیایەکە لەمەککە .
٥ـ تأريخ خليفة ص٢٥١، بأسناده صحيح حتى إبن جريج .
٦ـ المحن لأبي العرب ص٢٠٣ .
٧ـ مواقف المعارضة ص٥٤٨ .

یەزیدی کوڕی معاویە لەنێوەڕاستی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ئەو ساڵەدا مرد.[١] هەواڵی مردنی یەزید - بەهۆی دووری نێوان دیمەشق ومەککە - لەسەرەتای مانگی ڕەبیعی دووەمی ٦٤ك گەیشتە (مەککە).[٢]

سوتاندنی (کەعبە) لەبەرنامەی هیچ کام لەدولایەنی شەڕەکە نەبوو؛ بۆیە بە قەومانی ئەو کارەساتە سام و ترس وبیمێکی گەورە لەسەر هەردولا دروست بوو،[٣] یەکێك لەخەڵکی شام هاواری دەکرد: سوێند بەوزاتەی گیانی محمدی لەدەستە هەردولا لەنێو چوون،[٤] هاوەڵانی ئیبن زوبێر لەترسی بارینی سزا هەموویان لە بەرەبەیانی شەوی سوتانی کەعبەدا لەگەڵ جەنازەی ژنێك چوونە دەرەوەی مزگەوتی حەرام، ئیبن زوبێر سەر لەسوژدە مابۆوەو دەیگوت: ئەی خودایە ئەوەی ڕوویداوە بەدەست ئەنقەستی من نەبووە، خودایە بەندەکانت بەتاوانی من سزامەدە، ئەمە نێو چاوانمەوە لەبەر هەردوو دەستتدایە.[٥]

خەڵکی شامیش: ئەگەر چی پێ دەچێ کەسانێکیان تێدا هەبووبێ گەورەیی کەسایەتی (ئیبن زوبێر)ی وەك پێویست نەناسیبێ،[٦] بەڵام کەسیان تێدا نەبووە گەورەیی وگرنگی و ڕێزو پیرۆزی کەعبەی نەزانیبێ؛ چونکە لە کاتێکدا گەمارۆی (ئیبن زوبێر) دەدەن، لەنێو کەعبەدا، لەهەمان کاتیشدا لەنوێژەکانیاندا ڕوو دەکەنە(کەعبە)ی پیرۆز، کەواتە مەحاڵە کەسێك لەئەوان هەبووبێ بەدەستی ئەنقەست (کەعبە)ی سوتاندبێ، هەروەها ئەم بابەتە بەبیری (حەسینی کوڕی نەمیر)ی سەرکردەی سوپاکە شیاندا نەهاتووە، کاتێك خزمە نزیکەکانی (ئیبن زوبێر) و زانایانی پێشین و زانایانی لێکۆڵەر باسی ئەم موسیبەتە دەکەن، ئەوا ئەم کارەساتە نادەنە پاڵ هیچ کەس وهیچ کام لەلایەنەکانی شەڕکەر؛ (هیشامی کوڕی

---

١ـ أنساب الأشراف (٣٤٤/٤)، تعجيل المنفعة ص٤٥٣ .
٢ـ مواقف المعارضة ص٤٨، أخبار مكة (١٩٧/١) .
٣ـ أخبار مكة (٢٠٣/١) .
٤ـ تأريخ خليفة ص٢٥٢ بأسناد صحيح .
٥ـ مواقف المعارضة ص٥٥٢، الأغاني (٢٢٧/٣) .
٦ـ مواقف المعارضة ص٥٥٢، حلية الأولياء (٣٣٦/١) .

عوروەی کوڕی زوبێر) دەڵێ: شەڕیان لەگەڵ (ئیبن زوبێر) کرد، (کەعبە) لەماوەی گەمارۆداندا سوتا.[١]

(ئیبن عبدالبر) دەڵێ: لەو گەمارۆیەدا (کەعبە) ئاگری گرت.[٢]

کۆڕای موسڵمانان: دەربارەی سوتانی کەعبە ئەوەیە، کە کەس لەخەڵکی شام نیازی سوکایەتی پێکردنی (کەعبە)ی پیرۆزی لەدڵدا نەبووە، بەڵکو هەموو موسڵمانان (کەعبە) بە گەورەو پیرۆز دادەنێن، ئەوان ـ خەڵکی شامی نەبوو، تەنها مەبەستیان گەمارۆدانی (ئیبن زوبێر) بووە نەك (کەعبە)، (یەزید) کەعبەی نەڕوخاندووەو نەسوتاندووە، هەروەها جێگرو وەکیلەکانیشی ئەم کارەیان لەنیازو بەرنامەدا نەبووە.[٣]

بەم جۆرە یەکێك لەئەنجامە تاڵەکانی ئەم شەڕەی نێوان (حەسینی کوڕی نەمیر)و (ئیبن زوبێر) سوتانی (بەیتو لحەڕام) بوو.[٤]

کاتێك (حەسین) هەواڵی مردنی (خەلیفە)ی پێگەیشت یەکسەر نوێنەری ناردە لای (ئیبن زوبێر)، گوتی: (ئەمشەو شوێنی گفتوگۆی نێوانمان (ئەبتەح)ە، بابەتی گفتوگۆ قسەکردن بوو لەسەر مەسەلەی خیلافەتی دوای یەزید هەندێك لەو قسانەی (حەسین) کە لەڕووی (ئیبن زوبێر)دا کردنی ئەوە بوو، کە بانگهێشتی دەکرد بۆ پۆستی خیلافەت وپێ ی گوت: (ئێستا ئەو پیاوە ـ واتە یەزید ـ مرد، تۆ لەهەموو کەس لەپێشتری بۆ وەرگرتنی پۆستی خیلافەت، هەستە وەرە لەگەڵمان بۆ شام تابەیعەتت بدەینێ، ئەم سەربازانەی لەگەڵ منن؛ هەموویان پیاو ماقوڵ و سوارچاکانی وڵاتی شامن بەڵێن بێ دووکەس لەسەر ـ بەیعەتدان بەتۆ ـ ناکۆك نابن، دەچین بۆ ئەوێ و خەڵکی هێمن دەکەینەوەو بارودۆخیش ئاسایی دەبێتەوە، تۆماری خوێنی ڕژاوی نێوان ئێمەو ئەهلی (حوڕڕە)و ئێمە وئێوە دادەخەین و

---

١ـ الإصابة (٩٤/٤) عن الزبیر بن بکار بسند صحیح .

٢ـ الإستیعاب (٢٤٣/٣) .

٣ـ منهاج السنة (٤٤٧/٤)، مواقف المعارضة ص٥٥٢ .

٤ـ مواقف المعارضة ص٥٥٤ .

لاپەڕەی سپی هەڵدەدەینەوە)، عبداللـه گوتی: (چۆن حیساب بۆ ئەو خوێنـه نەکەم! بەخوا کوژراوێکی خۆم بەدەکەسی ئێوە ناگۆڕمەوە).

(حەسین)بە نهێنی قسەی دەکردن، بەلاَم (عبدالله)یەك بەخۆ دەنگی هەڵدێناو دەیگوت: (بەخودا نایکەم).

حەسین پیێ ی گوت: دەك ئەو کەسە خەجاڵەت بێ دوای ئەمە بەلێنت دەداتێ، من گومانی ڕایەکی باشم لێ چاوەڕێ دەکردی، نابیستی من بەنهێنی قسەت بۆ دەکەم و تۆش بەدەنگی بەرز لەگەڵم دەدوێ ی، بانگت دەکەم بۆ (خیلافەت) و تۆش هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکەی.[1]

دوای ئەوە لێك جیابوونەوە، (عبداللـه) بۆی دەرکەوت بەهەڵە داچووە؛ بۆیە ویستی هەڵەکە ڕاست بکاتەوە، کاتێك (حەسین) خۆی وسوپاکەی بارگەیان پێچایەوە بگەڕێنەوە بۆشام، (عبدالله) نوێنەری ناردەلاو پێ ی گوت: (دەربارەی پێشنیارەکەت ـ کەبێمە شام ـ، ئەوە ناکەم، چونکە پێم خۆش نیە (مەککە) بەجێ بێلَم، هەر لەوێ بەیعەتم بدەنێ، منیش دلَنیاتان دەکەم کەدەتانخەمە هێمنی و ئاسایشەوەو بەعەدالَەت و دادپەروەری حوکمڕانیتان دەکەم).

حەسین وەلاَمی دایەوە: ئەگەر خودی خۆت نەیەیت نابێ، چونکە کەسانێکی زۆری بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) داوای ئەم پۆستە دەکەن وخەڵکیش پشتگیریان دەکات! دوای ئەمە من هیچم لەدەست نایە.[2]

بیلال زەڕپی دەلَێ: عبداللەی کوڕی زوبێر داوای لەحەسین کرد مۆڵەتی بدا، تا ڕاوێژ بەهاوەلاَنی دەکات، بەلاَم هاوەڵەکانی چوونە شامیان ڕەت کردەوە.[3]

هەڵبەتە بەی بردن بەناخی ئیبن وزوبێرو بۆ چوونەکانی لەزەینی دا دێن ودەچن سەبارەت بەڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی حەسین کارێکی گرانە، بەلاَم دەتوانین

---

١ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .

٢ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .

٣ـ أنساب الأشراف (٤/٥٧،٥٨)، عبدالله بن الزبير، د.شحادة الناطور ص١٠٧ .

بەچاوی عیبرەت وپەند وەرگرتن لەبارودۆخی سیاسی ئەوکاتەی حیجاز[١]، ئاماژە بە هەندێك هۆکار بکەین:

أ‌- ئەم جۆرە پێشنیارە لەلایەن کەسێکی وەك (حەسین)ەوە قابیلی قبولّ نیە؛ چونکە (حەسین) سیفەتێکی ڕەسمی وسیاسی ئاوای نیە لەدەوڵەتی (ئومەوی)دا بتوانێ بڕیاری بەڵێنی ئاوا سەر بەخۆ بدات، لەگەڵ ئەوەشدا دەیگوت: ئەو سەربازانەی لەگەڵیدان پیاو ماقولّ وسوارچاکانی شامن، بەڵام چۆن دەچێتە مێشکەوە: (ئیبن زوبێر) متمانە بەسەرکردەی سوپایەك بکات کە تادوێنێ پەلاماری داوەو لەگەڵی جەنگاوە، لەلایەکی ترەوە دژایەتی لەنێو قسەکانی (حەسین)دا دەرکەوت بەگوتەی: (ئەگەر خودی خۆت نەیەت بۆ شام، کەسانێك لەنێو بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) بەچاوی خۆت دەبینی کەداوای پۆستی خیلافەت دەکەن وخەڵکیش پشتیوانیان دەکەن.[٢]

ب ـــ (حەسین) یەکێك بوو لەسەرکردەکانی جەنگی (حوڕڕە) ژمارەیەك لەڕزگاریوانی ئەم جەنگە لەدەورەی (ئیبن زوبێر) بوون، بۆ ئەوەی گومانێك لەدلّ و دەرونی ئەواندا پەیدا نەبێت (ئیبن زوبێر) بەدەنگی بەرز قسەی لەگەڵ (حەسین)دا دەکرد، هەر لەبەر ئەمەش بەڕاشکاوی گوتی: ئەو لەبەرامبەر یەك نەفەری کوژراوی (مەدینە) بەکوشتنەوەی کەمتر لە دەنەفەر ڕازی نابێت لەسوپاکەی (حەسین)دا.[٣]

ج ـ تا ئەوکاتە (ئیبن زوبێر) لەشامدا بێ پشتیوان و هاوهەڵوێست بوو، خەڵکی شامیش ڕێزو خۆشەویستی وسەروەری ئومەویەکانیان قبولّ بوو.

د ـ ئیبن زوبێر سوپایەکی ڕێکخراوی سەربازی وەك (سوپای ئومەوی) نەبوو، دەتوانین بە سەربازەکانی بڵێین (بەرگریکار)انی (مەککە)و ئیبن زوبێرو بەس؛ چونکە ئەم جەنگاوەرانە لەکاتی ناخۆشی دا لەدەورەی کۆدەبوونەوەو لەکاتی

---

١ـ عبدالله بن الزبير، ماجد لحام ص١١٥ .
٢ـ تأريخ الطبري (٦/٤٣٦) .
٣ـ عبدالله بن الزبير، ماجد لحام ص١١٦ .

خۆشی وئاسایی دا بڵاوەیان لێ دەکردو دەچوونەوە سەرکارو پیشەی خۆیان، ئەگەر ئیبن زوبێر سوپایەکی سەربازی ڕاهێنراوی تایبەتی هەبوایە بەجۆرێك توانیبای سەرکەوتن بۆ (ئیبن زوبێر) مسۆگەر بکات، ئەوا لەگەڵ (حەسینی کوڕی نەمیر) بەرەو شام دەڕۆیشت.[1]

---

١ـ عبدالله بن الزبير، د.شحادة الناطور ص١٠٩،١١٠ .

# بەشی چوارەم

# بەیعەتی عبداللەی کوڕی زوبێر بۆ خیلافەت.

## باسی یەکەم: مردنی یەزیدی کوڕی معاویەو خیلافەتی معاویەی کوڕی یەزید

### یەکەم: مردنی یەزیدی کوڕی معاویە:

بەقسەی هەندێك مێژوونوس: یەزید لە١٤/ڕەبیعی یەکەمی/٦٤ك لەگوندی (حەووارین)ی سەربەشاری (حمیس)ی وڵاتی شام لەتەمەنی ٣٨ساڵیدا مرد.

هیشامی کوڕی وەلیدی مەخزومی دەگێڕێتەوە، کە (زوهەری) تەمەنی (خەلیفە)کانی لەزاری باپیریەوە نووسیوە، دەربارەی (یەزید) دەڵێ: یەزیدی کوڕی معاویە لەتەمەنی ٣٩ساڵیدا مردووە، ماوەی خیلافەتی ٣ساڵ و٦ مانگ بووە، گوتراویشە: ٣ساڵ و٨مانگ بووە.[1]

ئەبو مەعشەر دەڵێ: یەزیدی کوڕی معاویە لەڕۆژی ٣شەممە ١٤/ڕەبیعی یەکەم مردووە، ماوەی خیلافەتی ٣ ساڵ وحەوت مانگ و٢٢ڕۆژ بووە، معاویەی کوڕی نوێژی لەسەرکرد،[2] گوتراویشە: ماوەی خیلافەتی ٣ساڵ و ٩مانگ چەن ڕۆژ کەم بووە،[3] نەخشی ئەنگوستیلەکەی یەزید(ربُنا اللّه) بوو.[4]

### دووەم: خیلافەتی معاویەی کوڕی یەزید:

معاویەی کوڕی یەزید سێهەمین خەلیفەی ئومەویە، ناسناوی: ئەبو یەزید یان

---

١ـ تأریخ الطبري (٦/٤٣٣) .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ تأریخ القضاعي ص٣٢٩ .

٤ـ هەمان سەرچاوە.

(ئەبو عبدالرحمن)ە، باوكی: یەزیدی كوڕی معاویەی كوڕی ئەبو سوفیانە، دایكی: ئومو هاشیم كچی ئەبو هاشم ی كوڕی عوتبەی كچی ڕەبیعەیە،[١] پێ ی دەگوترا: معاویەی بچووك،[٢] دوابەدوای مردنی (یەزید)ی بابی لە١٤/ڕەبیعی یەكەمی/٦٤ك بەیعەتی خیلافەتی پێدرا.

ڕوخساری معاویە رحمه الله: ڕەنگی سپی بوو، مووی سەرو ڕیشی پڕ بوو، چاوەكانی گەورە بوون، مووەكانی سەری لولپێچ بوون، لوتی باریك وشوشەیی وبچوك بوو، سەری خڕبوو، دەموچاوی جوان بوو، مووەكانی ڕیشی پڕو باریك بوون، جەستەی ڕێكو پێك بوو، پیاوێكی تابڵێ ی سالح وخودا پەرست بوو.[٣]

### ١ــ ماوەی حوكمڕانی:

مێژوو نووسان جیاوازیان زۆرە سەبارەت ماوەی حوكم گێڕانی (معاویەی كوڕی یەزید)، جیاوازیەكە لەنێوان (٢٠)[٤] ڕۆژ تا(٣) مانگدا دێت ودەچێ، وەك دەردەكەوێ ماوەی(٣) مانگە كەڕاستتر بێ، هەندێك مێژوو نووس دەڵێن ماوەی (٤٠) ڕۆژ بووە، لەماوەی حوكم گێڕانیدا هەر نەخۆش بووە؛ بۆیەشە چ شوێنەوارێكی چالاكی ئەو لەو ماوەی حوكمەتەكەیدا بەرچاو نایەت، نەخۆشیەكەی هێندە توند بووە نەیتوانیو پێشنوێژیش بۆ خەڵك بكات، هەتا (معاویە) وەفاتی كرد (زوحاكی كوڕی قەیس) پێشنوێژی دەكردو كاروباری خیلافەتی هەڵدەسوڕاند، (زوحاك) لەسەر ئەم كارەی بەردەوام بوو تا ئەو كاتەی مەڕوانی كوڕی حەكەم كەوتە سەر حوكم لەشام.[٥]

### ٢ ــ دابەزینی لە پۆستی خیلافەت وبەجێهێشتنی بۆ شوڕا:

معاویەی كوڕی یەزید هەستی بەخۆی كرد كە كەوتۆتە گیانەڵای مەرگەوە، كە جاڕیدا باهەموو خەڵك بێتە نوێژی جەماعەت، پاش تەواو بوونی نوێژ وتارێكی بۆ

---

١ـ تاریخ الطبري (٦/٤٣٤) .
٢ـ الأمویون بن المشرق والمغرب (١/٢٨٦) .
٣ـ البدایة والنهایة (١١/٦٦٣) .
٤ـ هەمان سەرچاوە (١١/٦٦٢) .
٥ـ البدایة والنهایة (١١/٦٦٣) .

دەدان، لەو قسانەی کردنی: من کاروباری ئێوەم کەوتۆتە بەردەست ولەڕاپەڕاندنیدا لاوازم، ئەگەر حەزدەکەن بۆ پیاوێکی بەهێزی بەجێ دێڵم چۆن (صدیق) بۆ (عومەر)ی بەجێهێشت، ئەگەر دەشڵێن بەجێ ی دێڵم بۆ شوڕایەکی (٦) نەفەری چۆن (عومەر) بەم شێوەیە ڕەتاریکرد، من لەم کاتەدا کەسێکی واشك نابەم بۆ ئەم کارە گونجاوو شیاو بێ، وازم لەخیلافەت هێنا، خۆتان کێ بەگونجاو وشیاو دەزانن بیکەنە فەرمانڕەوای خۆتان.

ئینجا لەسەر مینبەر دابەزی و چووە ماڵەوە، تاوەفاتی کرد لەماڵەوە بوو و دەرنەچوو رحمه الله[1]

(معاویەی کوڕی یەزید) ویستی پێیان بڵێ: ئەو نەوێنەی (عومەر)ی دەستدەکەوێ، کە(ئەبوبەکر) داینا، نەوینەی ڕاوێژکارانێکیشی دەستدەکەوێ، کە(عومەر) دایانا؛ بۆیە ئەم ئەرکەی بەخۆیان سپارد.

لەو گێڕانەوەکەی (ئیبن لئەثیر)دا ئەمەی بەڕاشکاوی گوتووە کەدەڵێ: (بەلام پاش حەمدو سەنا: من لە بەرامبەر ڕاپەڕاندنی کاروبارتاندا بێ هێزو دەستە پاچە بووم، چاوم لەکەسێکی وەك (عومەری کوڕی خەتتاب) گێڕا کە(ئەبوبەکر) کردیە خەلیفە، دەستم نەکەوت، گەڕام بەدوای (٦) کەسی وێنەی (٦) ڕاوێژکارەکە ـ ی عومەر دایانان دەستم نەکەوتن، خۆتان لەپێشترن بۆ کاروبارتان، کێتان حەز لێیە بۆ ئەم کارە هەڵیبژێرن)، ئینجا چووە ماڵەوە وتامرد خۆی پەنهان کرد.[2]

ئەم هەڵوێستەی بەڵگەیە کە ئەو ناڕازی بووە لەسەر مەسەلەی گواستنەوەی خیلافەت لەشوڕاوە بۆ میرات و وەسێت،[3] ئەو ڕازی نەبوو کەسێك لەبنەماڵەی خۆی بکاتە وەلی عەهدی خۆی، پێیان گوت: ئەم پەیمانە بخە ئەسۆی کەسێکی نێو بنەماڵەکەت، وەلامیدانەوە: بەخوا شیرنایەتی سەرۆکایەتیکردنی ئێوەم تام نەکردووە، جا چۆن تاوانەکەی هەڵدەگرم، ئێوە پەلەی چەشتنی شیرنایەتیەکەی

---

١ـ البداية والنهاية (٦٦٣/١١، ٦٦٤) .

٢ـ الكامل في التأريخ (٦٠٥/٢) .

٣ـ العلم الأسلامي في العصر الأموي ص١٢٧ .

دەکەن، منیش هەست بە تالأییەکەی دەکەم، خودایە من لێ ی بەریم و وازی لێ دێنم.[١]

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: پێی گوترا: ئایا وەسێت ناکەی؟ گوتی: تالأییەکەی بکەمە توێشوی قیامەتم و شیرنایەتیەکەی بۆ (بەنی ئومەییە) بەجێ بێلم؟[٢] دابەزینی (معاویەی کوڕی یەزید) لەپۆستی حوکمڕانی بەڕوداوێکی تاقانەی نێو مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێ، زانیومانە سەرۆکانێك وازیان لە پۆستی خۆیان هێناوە بەلام لەژێر فشاری ماددی یان مەعنەویدا بووە، بەلام شایەك یان سەرۆکێك واز لەپۆستەکەی بێنێ چونکە کە سانێکی لە پێشترو شیاوتر هەن لەنێو گەلەکەیدا بۆ ئەو پۆستە، ئەوا بەسەر ئەم جۆرە سەرۆکانەدا نەکەوتوین، چ حیساب لەگەڵ خۆکردنێك لەم حیسابەی معاویە لەگەڵ خۆی کرد جوانترو بەرزترە؟!.[٣]

ئەگەر (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ی یەکەم خەلیفەی ئومەوی، خیلافەتی لەشوڕاوە گواستەوە بۆ خاوەنداریتی، ئێستا لەم بارودۆخەدا (معاویەی دووەم)ی نەوەی سێهەم خەلیفەی ئومەوی خیلافەت لە خاوەنداریتی یەوە دەگوازێتەوە بۆ شوڕا.

چاك وایە بەچاوی عەدالەت و ویژدانەو بڕوانرێتە دەولەتی ئومەوی وهەرحیساب لەسەر لانی یەکەم واتە خاوەنداریتی وخۆسەپێنی دەولەتەکە نەکرێت، بەلکو حیسابیش بۆ لانی دووەم واتە چاکسازیەکەی معاویەی دووەم وگواستنەوەی خاوەنداریتی بۆ شوڕاش بکرێت.[٤]

**٣ ـ کاتێك مرد، تەمەنی چەند بوو ؟، کێ نوێژی لەسەرکرد ؟**

معاویەی کوڕی یەزید لەتەمەنی (٢١) سالیدا مرد، دەشلێن: ٢٣ سال و (١٨) ڕۆژ بوو، دەلێن: (١٩) سال بوو، دەلێن: ٢٠ سال بوو، دەلێن: ٢٣ سال بوو، دەلێن:

---

١ـ مروج الذهب (٣/٨٢) .
٢ـ البداية والنهاية (١١/٦٦٣) .
٣ـ نظام الحمك في الشريعة والتأريخ (١/١١٦) .
٤ـ الدولة الأموية المفترى عليها ص٢٩٢ .

١٨ ساڵ بوو، دەڵێن: ١٥ ساڵ بوو، خودا چاکتر دەزانێ.

خالیدی برای نوێژی لەسەر کرد، دەشڵێن: عوسمانی کوڕی عەنبەسە نوێژی لەسەر کرد، دەڵێن: وەلیدی کوڕی عوتبە نوێژی لەسەر کرد، ئەم گێڕانەوەی دوایە ڕاستە؛ چونکە معاویە وەسێتی بۆ وەلید کرد بوو نوێژی لەسەر بکات، (مەڕوانی کوڕی حەکەم)یش ئامادەی ناشتنەکەی بوو،[1] مەڕوان گوتی: دەزانن کێ بوو ئەسپاردەتان کرد؟ گوتیان: بەڵێ: معاویەی کوڕی یەزید بوو (مەڕوان) گوتی: (ئەو) ئەو (ئەبو لەیلا)یە یەکە ئەزنو مولفوزاری دەربارەی گوتوویەتی:

إنــــي أرى فتنــــة تغلــــي مراجلــــها
والـملك بعــد أبـي ليلى لمن غلبـا.[2]

## ٤ ـ تەنگژەیەکی سامناك دوای مردنی معاویەی کوڕی یەزید:

معاویەی کوڕی یەزید تەنگژەیەکی ترسناکی بۆ دوای خۆی دروستکرد، خالیدی برای منداڵ بوو، دەسەڵاتی (ئیبن زوبێر)یش هەر بەهێزو فراوان دەبوو، خەڵکێکی زۆری ژێر دەسەڵاتی ئومەوی بەیعەتیان دایە، تیپێکی سوپای شام لەسەروی هەموویانەوە (زوحاکی کوڕی قەیس)ی فەرماندەی دیمەشق بڕیاریاندا بەیعەت بە(ئیبن زوبێر) بدەن، تا حاڵ بەوەگەیی (مەڕوانی کوڕی حەکەم) سەرگەورەی ئەوکاتی (بەنی ئومەییە) بیری لەچوونە لای (ئیبن زوبێر) کردەوە تا بەیعەتی پێبداو ئەمان وزەمانی لێ وەربگرێت، بەڵام هەموو ئەو سەربازو سەرۆکانەی هۆزەکانی یەمەنی، کەبە تواناترین پشتیوانانی بەنی ئومەییە بوون وخاڵانی یەزید بوون بەسەرکردایەتی (حیسانی کوڕی مالیك) نەیانهێشت خیلافەت لە(بەنی ئومەییە) دەرچێت وبەیعەتیان نەدا بە(ئیبن زوبێر):

ناکۆکی وپشێویەکی زۆر ڕویداو (شام) شەش مانگ بێ ئیمام وپێشەوا بوو، پاشان ڕێکەوتن لەسەر بەستنی کۆبوونەوەیەك بۆ ڕاوێژکردن لەسەر دیاریکردنی

---

[1] ـ البداية والنهاية (١١/٦٦٢،٦٦٣) .
[2] ـ هەمان سەرچاوە (١١/٦٦٤) .

کەسێکی شیاوو گونجاو بۆ پۆستی خیلافەت ودەرەنجام بڕیارێکی بۆ دەربکەن.[1]

(معاویەی کوڕی یەزید) دواین خەلیفەی لقی (سوفیانی) بوو، دوای ئەو خیلافەت لە لقی (سوفیانی)یەوە بۆ لقی دووەمی تایەفەی (بەنی ئومەییە) واتە: لقی (مەڕوانی) گوازرایەوە، یەکەم دەسەلاتبە دەستی ئەم لقە (مەڕوانی کوڕی حەکەم) بوو، زۆربەی لێکۆڵەرو مێژوو نووسان بەناوی (خەلیفە) ناوی ناهێنن، دەڵێن ستەمکار بووەو لەدژی خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران (عبداللەی کوڕی زوبێر) دەرچووە، سەبارەت (عبدالملك)ی کوڕیشی هەمان هەڵوێستیان هەیە تا ئەو کاتەی (ئیبن زوبێر) شەهید دەبێ، کۆڕای جەماوەری موسڵمانانیش لەسەر ئەمەیە.[2]

بەمردنی (معاویەی کوڕی یەزید) کۆتایی بە دەوڵەتی (سوفیانی) هات ودەوڵەتی (زوبێر) دەرکەوت، بەڵام بەردەوام نەبوو؛ چونکە (بەنی مەڕوان) توانی کۆتایی بەم دەوڵەتە بێنێ، بەپشتیوانی خودا لەلاپەڕەکانی دادێ زیاتر لەسەر ئەم بابەتە دەڕۆین.

**سێهەم: بەیعەتی (ئیبن زوبێر) بۆ خیلافەت.**

دوای مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە) کەسێك نەبوو شایانی ئەوە بێ پێی بگوترێ (خەلیفە) لەبنەماڵەی ئومەوی دا، کاتێك یەزید وەسێت بۆ (معاویە)ی کوڕی دەکات، ئەمە بەتەنها بەشی دامەزراندنی بەیعەت ناکات؛ چونکە بەیعەت بەبێ شوڕا نابێ، زیاد لەمەش ئەوانەی بەیعەتیان بە(معاویەی کوڕی یەزید)دا بوو لەخەڵکی (دیمەشق)و دەوروبەری و کەسە دیارەکانی (بەنی کەلب) تێپەڕی نەدەکرد، وێڕای ئەمەش (معاویەی کوڕی یەزید) زۆر نەژیاو دەسەلاتی بۆ شوڕا بەجێهێشت وکەسی لەجێ ی خۆی دانەناو وەسێتیشی بۆ کەس نەکرد.

لەهەمان کاتدا: بەیعەتی خیلافەت لە سەرتاسەری وڵاتانی ئیسلام بۆ (عبداللەی کوڕی زوبێر) دامەزرا، وەکو: وڵاتی حیجاز، وڵاتی (عێراق)و دەوروبەری تا ئەو پەڕی

---

١ـ النظريات السياسية الإسلامية، محمد ضياء الدين الريس ص٢٠٢ .

٢ـ الأمويون بين المشرق والمغرب ص٢٠٩ .

سنوری ڕۆژ هەڵات، وڵاتی (مصر)و دەوروبەری تا ئەو پەڕی سنوری ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلام، زۆربەی زۆری وڵاتی شام، جگە لەهەندێك شوێن لە (دیمەشق): (زوحاكی كوڕی قەیسی فەهدی)و لە(حیمس): (نوعمانی كوڕی بەشیر)و لە(قەنسرین): (زوفری كوڕی حاریسی كیلابی) و لە (فەلەستین): (ناتیلی كوڕی قەیس) بەیعەتیان دا بەئیبن زوبێر، (روحی كوڕی زنباعی جوزامی) بەیعەتی نەدا، لەشامیش جگە لەناوچەی (بەڵقا)، كە (حیسانی كوڕی مالیكی كوڕی بەحدەلی كەلبی)ی تێدا بوو، كەس بەیعەتدان بەئیبن زوبێری ڕەت نەكردەوە.[1]

بەم جۆرە بەیعەتی خیلافەت بۆ (عبداللەی كوڕی زوبێر) لەجیهانی ئیسلامدا دروست بوو وبوو بە(خەلیفە)ی شەرعی.[2]

(عبدالله) كاربەدەستانی خۆی بەسەر هەرێمەكاندا دامەزراندن، خەریكە تەواوی سەرچاوەكانی مێژوو یەكدەنگ بن لەسەر ئەوە، كە هەموو وڵاتانی جیهانی ئیسلام پۆستی خیلافەتیان بەسەر (عبدالله)دا سەپاندووەو كردوویانە بە(خەلیفە)ی خۆیان؛ بۆیە ژمارەیەك لەزانایان و مێژوو نووسان بەڕاشكاوی دەڵێن: بەیعەتی (ئیبن زوبێر) بەیعەتێكی شەرعی بووەو ئەو لە(مەڕوای كوڕی حەكەم) شایانترو لەپێشتر بووە بۆ ئەم پۆستە.[3]

(إبن عبدالبر) لە(مالك)ەوە دەگێڕێتەوە: ئیبن زوبێر لە مەڕوانی كوڕی حەكەم باشتر بووەو شایانتر بووە بۆ ئەو كارە، بەهەمان شێوە لە(عبدالملك)ی كوڕیشی.[4]

(إبن كثیر) دەڵێ: بێگومان (ئیبن زوبێر) دوای مردنی (معاویەی كوڕی یەزید) ئیمام وپێشەوای موسڵمانان بووە، لەبواری زانست وزیریدا لە (مەڕوانی كوڕی حەكەم) پێگەیشتووتر بووە، دوای ئەوەی ڕایەكان لە سەرتاسەری وڵاتانی ئیسلام بۆبەیعەتدان بەعبداللەی كوڕی زوبێر بوونە یەك، بەڵام(مەڕوان) لەبەیعەت دەرچوو و

---

١ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٧٣)، عبدالله بن الزبير، محمود شاكر ص٦٦ .
٢ـ عبدالله بن الزبير، محمود شاكر ص٦٨ .
٣ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١١٧ .
٤ـ الإستيعاب (٣/٩١٠) .

بەربەرەكانێ ی كرد).[١]

هەركام لە(إبن حزم)[٢] و (سیوطي)[٣]یش دڵنیان لەسەر شەرعی بوونی خیلافەت (ئیبن زوبێر)، پێیان وایە: مەڕوانی كوڕی حەكەم و(عبدالملك)ی كوڕی ستەمكار بوون ولەژێر فەرمانی (خەلیفە)ی شەرعی دەرچوون، هەروەها (ذهبی)یش شەرعیەتی خیلافەتی (ئیبن زوبێر) ساغ دەكاتەوەو بە(ئەمیری ئیمانداران)ی دادەنێ.[٤]

### ١ــ بەیعەتی (ئیبن زوبێر) لە (حیجاز):

دانیشتوانی حیجاز بەپەلەو بێ دواكەوتی بەیعەتیان بە(عبدالله كوڕی زوبێر)دا، ئەم كارەیان شتێكی ئاسایی بوو؛ چونكە (حیجاز) مەڵبەندی ڕاپەڕین و دژایەتیكردنی حوكمەتی (بەنی ئومەییە) بوو.

(إبن سعد) دەگێڕێتەوە: ئەو كەسایەتیانەی بوونە پێشەنگ ودەستپێشخەریان كرد لەبەیعەتدان: (عبداللەی كوڕی موتیعی عەدەوی) عبداللەی كوڕی ڕیزوانی كوڕی ئومەییەی جەمەحی، حاریسی كوڕی عبداللەی كوڕی ئەبی ڕەبیعە، عوبەیدی كوڕی عومەیر، عوبەیدوڵلای كوڕی عەلی كوڕی ئەبیتالیب، عبداللەی كوڕی جەعفەر).[٥]

ژمارەیەك كەسایەتی نێو حیجاز بەیعەتیان پێنەدا، لە نێویاندا (٣) كەسایەتی ڕێزدارو كاریگەری دیاری و حیساب بۆ كراو بوون لەهەموو جیهانی ئیسلامدا بەگشتی و بەتایبەتیش لە(حیجان)دا: ئەو (٣)كەسە: عبداللەی كوڕی عومەری كوڕی خەتتاب، ئیبن عەبباس، محمدی كوڕی حەنەفییە، خەریكە سەرچاوەكان كۆك بن لەسەر ئەوە: هیچ كام لەم (٣) كەسایەتیە لەماوەی ژیانیاندا بەیعەتیان بە(عبداللەی كوڕی زوبێر) نەداوە.[٦]

---

١ــ البداية والنهاية، نقلاً عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص١١٧ .
٢ــ المحلي (١١/٩٨)، عبدالله بن الزبير، للخراشي ص١١٧ .
٣ــ تأريخ الخلفاء للسيوطي ص٢١٢، ابن الزبير، للخراشي ص١١٨ .
٤ــ سير أعلام النبلاء (٣/٣٦٣) .
٥ــ أنساب الأشراف (١/٣٥٢)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١١٩ .
٦ــ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١١٩ .

ا ــ هەڵوێستی (ئیبن عومەر) بەرامبەر بەیعەتی (ئیبن زوبێر):

ئیبن عومەر بەیعەتی خیلافەتی دابە (یەزید)، هەوڵیدا قنیات بە(ئیبن زوبێر) بکابەمەو لەبازنەی دەسەڵاتی یەزید دەرنەچێت وفیتنەو ئاشوب بەرپانەکات.[1]

دوای مردنی (معاویەی کوڕی یەزید) بەیعەتی خیلافەت بە(ئیبن زوبێر) درا، ئیبن زوبێر داوای لە ئیبن عومەر کرد دەستی بەیعەتی بداتێ، (ئیبن عومەر) ڕەتی کردەوە، بەبیانووی ئەوەی وەك بۆ خۆی دەڵێ: دەستی ڕاستەم نابەخشم بۆ لێکبوون وڕێشی لێناکرم بۆ یەکبوون.[2]

(ئیبن زوبێر)یش تۆبزی لە(ئیبن عومەر) نەکرد بەیعەتی بداتێ، سەرچاوەکانیش ئامارە بەهیچ گرژی وڕووبەڕوو بوونەوەیەکی نێوان ئەم دوو کەسایەتیە ناکەن.[3]

خۆکێشانەوەی (ئیبن عومەر) لەبەیعەتدان، کاریگەری خراپی هەبوو بۆ سەر ڕای گشتی؛ چونکە ئەو کەسێکی ڕێز لێگیراوو حیساب بۆ کراوو شکۆداربوو بەتایبەت لە(حیجاز)دا، ئەم کاریگەریە کاتێك تینی بۆ سەر خیلافەتی (ئیبن زوبێر) دێنا، کە هەوادارانی خۆی ناچار دەکرد هەمان هەڵوێستی ئەو بگرنە بەر لەبەرامبەر (ئیبن زوبێر)دا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا: (ئیبن عومەر) ترسناکیەکی ڕاستەقینەی بۆ سەر (ئیبن زوبێر) نەبوو؛ چونکە ئەو چاوی نەبڕیبووە پۆستی (خیلافەت)و شوێنکەوتوانێکی وا زۆریشی نەبوون بتوانێ ڕووبەڕووی (ئیبن زوبێر)یان پێ بکاتەوە، هەمان حاڵەت بەسەر (محمدی کوڕی حەنەفییە)شدا دەچەسپێ.[4]

ب ــ (ئیبن عەبباس)و بەیعەتی (ئیبن زوبێر):

ئیبن عەبباس لەهەڵوێستەکانیدا بەرامبەر ئاژاوەکانی سەردەمی خۆی لە (ئیبن عومەر) جیاوازبوو، ئەو لە هەردووك ڕووداوی (جمل) و(صفین)دا بەشدار بووە و

---

١ـ مصنف بن أبي شيبة (١٥/٨٤) .
٢ـ أنساب الأشراف (١/٣٥٢)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٠ .
٣ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢١ .
٤ـ هەمان سەرچاوە ص١٢٢ .

پشتیوانی(عەلی كوڕی ئەبی تالیبی) كردووە، كاتێك ئومەویەكان هاتنە سەر حوكم و (معاویە) یەزیدی لەجێی خۆی دانا، خێرا بەیعەتی دا بە(یەزید) پابەند بووە بەم پەیمانەوە كاتێك (ئیبن زوبێر) بەیعەتی(یەزید)ی ڕەتكردەوە، نەزانراوە كەم و زۆر لەلایەن (ئیبن عەبباس)ەوە پشتیوانی لێ كرابێ، لەهەمان كاتیشدا دژایەتی خۆشی بۆ (ئیبن زوبێر) دەرنەبڕیوە، دوابەدوای مردنی (یەزیدی كوڕی معاویە) پەیوەندی نێوان ئەم دوو پیاوە چووە قۆناغێكی نوێوە.

كاتێك لەساڵی ٦٤ك بەیعەتی هەمەلایەنە درابە (ئیبن زوبێر)، داوای لە(محمدی كوڕی حەنەفییەو ئیبن عەبباس) كرد بەیعەتی پێ بدەن، ئەوان گوتیان: تا هەموو وڵات بۆ تۆ كۆدەبێتەوە خەڵك بەگشتی لەسەر تۆپێك دێن[1] ئەوكات بەیعەتت دەدەینێ، بەڵێنیان پێدا ناكۆكی خۆیان لەگەڵیدا دەرنەخەن.[2]

ئیبن زوبێر لەسەرەتای كاریدا ناچاری نەكردن بەیعەتی پێبدەن، پەیوەندی نێوان (ئینو عەبباس)و (ئیبن زوبێر) لەخۆشیدا بوو، ژمارەیەك ڕیوایەت دەبنە بەڵگە لەسەر هەست ونەستی دڵسۆزانەی ئیبن عەبباس) بۆ(ئیبن زوبێر)و وەك دەردەكەوێ لەهەندێك هەڵوێستی دا پشتگیریشی كردووە[3]، وبەڕاشكاوی باسی چاكەو باشەی ئەوی كردووە.[4]

عبدالرزاق لە(مصنف)ەكەیدا دەگێڕێتەوە:

ئیبن عەبباس قازی ئیبن زوبێر بوو لە (مەككە)، بەڵام دوای پەیوەندی یان تەمومژی تێكەوت، بەپێ ی هەندێك گێڕانەوە: نێوانی ئەم دوو كەسایەتیە تێكچووە، بەڵام هیچ كام لەگێڕانەوەكان ئەم ناخۆشیە لەبازنەی گفتوگۆی توندوتیژ ناترازێنن.[5]

---

١ـ الطبقات( ٥/١٠٠) .
٢ـ البداية والنهاية، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٥ .
٣ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٥، الفتح الرباني للساعاتي (١٦٧/٣) .
٤ـ تأريخ إبن عساكر، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٥ .
٥ـ الفتح الربان للساعاتي (٩٨/١٢)، أخبار مكة (٧٢/٢) .

وەك تێبینی دەکرێت (ئیبن عەبباس) و (محمدی کوڕی حەنەفییە) بەجووتە بەیعەتیان ڕەت کردەوە تاسەری کێشا بۆ تەنگاوبوونی (ئیبن عەبباس) و دەرچوونی بۆ (تایف)و نیشتەجێ بوونی لەوێ تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد.[١]

ئیبن عەبباس هەمیشە وەسفی چاکەی ئیبن زوبێری کردووە، هەرجار ناوی ئەویان لاهێنابایە: دەیگوت: قورئانخوێنە، پاکدامێنە، (زوبێر) باوکیەتی، (ئەبوبەکر) باپیریەتی، (خەدیجە) پوریەتی، (عائیشە) پوریەتی، صەفییە نەنکیەتی.[٢]

**ج ــ ئیبن لحەنەفییەو بەیعەتی ئیبن زوبێر:**

ئیبن لحەنەفییە دوای مردنی (یەزید) بڕیاری خۆیداو گوتی: کەبەیعەت نادا بەکەس تاڕای گشتی لەسەر یەك دەنگ نەبێ.[٣]

سەرەتا ئیبن زوبێر ئیبن لحەنەفییەی سەغڵەت نەکردو ناچاری نەکرد بەیعەتی پێبدا، بەڵام دوای فراوانبونی دەسەڵاتی و بەیعەتپێدرانی لەلایەن نوێنەرانی هەموو هەرێمەکانەوەو خەریك بوو ئوممەت لەسەر خیلافەتی ئەو کۆك بێ، (ئیبن زوبێر) هەستی کرد کەکاتی ئەوە هاتووە (ئیبن لحەنەفییە) بێت وبەپێ ی بەڵێنەکەی خۆی بەیعەتی پێ بدات، جارێکی ترو لەساڵی ٦٥ك داوای لێکردەوە بەیعەت بدا، بەڵام (ئیبن لحەنەفییە) بەیعەتی پێ نەدا، ئەویش لە(شیعەب) بەندی کرد.[٤]

پێ دەچێ (ئیبن زوبێر) لەبانگەوازەکەی (موختاری کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفی) ترسابێ لە(کوفە)، موختار: لەکاتی گەمارۆدانی مەککە لەساڵی ٦٤ك لەلایەن سوپاکەی (حەسینی کوڕی نەمیر)ەوە، یەکێك بوو لەگەورە بەریگریکارانی (ئیبن زوبێر)، ئەو وێڕای ئازایەتی ولەخۆ بوور دوویی بەفێڵ وزیرەکی وزرنگیش

١ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٥٨) .
٢ـ هەمان سەرچاوە (٣/٣٦٧) .
٣ـ مصنف بن أبي شيبة (١٥/٧٣)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٧ .
٤ـ تأريخ خليفة ص٢٦٢ .

بەهرەدار بوو، حەزکردن بەپایەبەرزی و سەرۆکایەتی لەتەختایی نێو چاوانی دا دەخوێنرایەوە.[١]

بۆی دەرکەوت لەلای (ئیبن زوبێر) بەئاوات و مرادەکانی ناگات؛ بۆیە چاوی لەشوێنێك دەگێڕا بۆی بچێت و داخوازیە دەرونیەکانی خۆی تێدا دەستەبەر بکات، دوای تێپەڕینی (٦)مانگ بەسەر ڕووداوی (گەمارۆ)کەدا و لەڕەمەزانی ٦٤ك؛ خۆی گەیاندە (عێراق)، لەڕێی بانگەوازی سەرخستنی بنەماڵەی پێغەمبەرﷺو بەرزکردنەوەی دروشمی سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی حوسێن، توانی جەماوەرێکی زۆر لەدڵ بەپەرۆشانی حوسێنو داخ لەدڵانی (بەنی ئومەییە) لەدەورەی خۆی کۆکاتەوەو پاشان دەستی بەسەر (کوفە)دا گرت.[٢]

لەلایەکی ترەوە: موختار بەکێشەی نێوان (ئیبن زوبێر)و (ئیبن لحەنەفییە)ی دەزانی، ویستی بەرهەمی کێشەکە قازانجی ئەو لەخۆبگرێت، دەیگوت: کەئەو نوێنەری (ئیبن لحەنەفییە)یە وبۆیەی ناردووە بۆ (عێراق) تا تۆڵەی (ئالوبەیت) بکاتەوە، لەواقیعدا (ئیبن لحەنەفییە) خۆی لەموختارو بانگەوازەکەی بێ بەریکردو، ڕایگەیاند کە ئەو بۆ (عێراق)ی نەناردووە.[٣]

جگە لەموختار(شیعە)ش بانگەشەیان دەکرد بۆلای (ئیبن لحەنەفییە).

لەبەر ئەمە (ئیبن زوبێر) ترسا دەروازەیەکی تری دژایەتی تیکردنی بەسەردا ئاوەڵابێت و کێشەکەی لێ ئاڵۆزتربێ.[٤]

وەرزی (حەج)ی ساڵی ٦٦ك، موختار سوپایەکی ناردە (مەککە)، سوپاکە (ئیبن لحەنەفییە)ی لەزیندان ئازاد کرد، (ئیبن لحەنەفەییە) بەبەڵگەی ئەوەی کەئەو شەڕو هەرا لە(حەڕەم)دا بە(حەڵاڵ) نازانێ، نەیهێشت سوپاکە شەڕ لەگەڵ (ئیبن زوبێر)دا بکات.[٥]

---

١ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٢٩ .
٢ـ تأريخ خليفة ص٢٦٣ .
٣ـ الطبقات (٥/٩٨) .
٤ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٣٠ .
٥ـ أنساب الأشراف، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٣١ .

لەواقیعدا: (ئیبن لحەنەفییە) بەهۆی ئەم سوپایەوە مەترسی یەکی گەورەی بۆ (ئیبن زوبێر) دروستکرد، سەرچاوەکان دەگێڕنەوە: (ئیبن لحەنەفییە) لەکاتی حەجدا ئاڵایەکی هەڵدا بوو کێبەرکەی ئاڵاکەی (ئیبن زوبێر)ی دەکرد.[1]

(ئیبن زوبێر) تەماشای کرد سەرچاوەی هێزو پشتیوانی (ئیبن لحەنەفییە) موختارو سوپاکەیەت؛ بۆیە نەخشەی لەنێو بردنی موختاری داڕشت، ڕاپەڕاندنی نەخشەکەی بە(موسعەبی برای)، کە والی (بەسرە) بوو سپارد، لە١٤/ڕەمەزانی/٦٧ك موسعەب کۆتایی بەموختار هێنا.[2]

کەموختار کوژرا، (ئیبن لحەنەفییە) لە(مەککە) جێگای پێ لێژ بوو، (إبن سعد) دەگێڕێتەوە پاش ئەمە ئیبن زوبێرعوروەی برای ناردەلای (ئیبن لحەنەفییە)و جارێکی تریش داوای لێکرد بەیعەتی بداتێ، ئەگەر ئەمە نەکا با چاوەڕێ ی شەڕبێ.[3]

(ئیبن لحەنەفییە) هەوڵیدا خۆی لەم فشارانەی (ئیبن زوبێر) ڕزگار بکات، لەم کاتەدا هەلێکی قۆزتەوە کە (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) داوای لێکردووە سەردانی (شام) بکات، بەم بیانووە خۆی وخەڵکی دەوروبەری بەرەو شام ڕۆیشتن وشاری (ئەیلە)[4]یان هەڵبژارد بۆ نیشتە جێبوون هەرچەندە ئەم شارە سەر بەوڵاتی (شام) بوو ولەژێر قەڵەمڕەوی (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) بوو، بەڵام لەسەر سنووری (حیجان) بوو وشوێنێکی نێوەڕاست بوو ولەهەردوك دەسەڵاتدارەوە دوور بوو بەڵام نیازو داخوازیەکانی عبدالملك لە(ئیبن لحەنەفییە) چ بڕ کەنتر نەبوون لەنیازو داخوازیەکانی(ئیبن زوبێر) عبدالملك پێی ڕاگەیاند: ئەگەر بەیعەتی پێ بدا سامان و بەخششێکی بەنرخی دەدا، ئەگەر نا نابێ لە (شام)دا نیشتەجێببێ، (ئیبن لحەنەفییە) بەو شێوەیەی مەرجی لەگەڵ (ئیبن زوبێر گرتبوو)، بەیعەتی عبدالملك یشی ڕەتکردەوەو شامی بەجێ هێشت و بەرەو (مەککە) هاتەوە، بەڵام (ئیبن

١ـ الطبقات (٣/٥)، تأريخ خليفة ص٢٦٣ .

٢ـ تأريخ خليفة ص٢٦٤، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٣١ .

٣ـ الطبقات (١٠٦/٥) .

٤ـ (أيلة) شارێکە لەسەر کەناری دەریای (قلزم)ی شام .

زوبێر) ڕێگەی نەدا بێتەوە نێو (مەککە)؛ بۆیە خۆی وهاوەڵانی ڕوویان کردە (طائف)، دەشڵێن ڕویان کردە (مەدینە)، بەهەر حاڵ تا(ئیبن زوبێر) کۆتایی پێهات لەوێدا نیشتە جێ بوون.[1]

**٢ـ بەیعەتی (ئیبن زوبێر) لە(عێراق):**

مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە) سەری کێشا بۆ شێوانی بارودۆخی (عێراق)و سەرهەڵدانی کێشەو ناکۆکی نێوان هۆزەکانی ئەوێ لەسەر دەسەڵات، (عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد) بەرەو شام هەلات، پێش هەلاتنی (خەواریج) زیندانیان شکاندو دەستیان بەگێرە شێوێنی وخراپەکاری کرد لەوڵات دا، پاش چەند شەڕو ئاژاوەیەك، هۆزەکانی (بصرة) ڕێکەوتن و(عبداللەی کوڕی حاریسی کوڕی نۆفلی کوڕی عبدالمطلب) یان کردە والی (بصرة).[2]

ئینجا(ئیبن زوبێر) دەستی کرد بەدامەزراندنی کاربەدەستانی خۆی لەویلایەتەکاندا، سەرە هاتە سەر (بصرة)و (موسعەبی) برای کردە والی ئەوێ، دانیشتوانی (کوفە) (عامری کوڕی خەلەفی قورەیشی)یان کردە کار بەڕێوەبەری خۆیان،[3] دەربارەی ئەم کارەیان نامەیەکیان بۆ (ئیبن زوبێر) نارد، ئەویش دانی پێداهێنا، لە ڕاستیدا ئەم هەڵسوکەوتەی دانیشتوانی (کوفە) بەڵگە بوو لەسەر داننان بەخیلافەتی (ئیبن زوبێر)[4]، بێگومان ڕەفتاری دانیشتوانی (کوفە) و (بصرە) لەبەرامبەر (ئیبن زوبێر)دا ڕەفتاریان بوو لەبەرامبەر خەلیفەی موسڵمانان.[5]

ژمارەیەك هۆکار یارمەتی بەیعەتدانی (ئیبن زوبێر)یان کرد لەعێراق دا، گرنگترینیان:

* دروست بوونی بۆشایی سیاسی لەوڵات دا بە مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە).

---

١ـ الطبقات (٥/١٠٧،١٠٨) .
٢ـ تأريخ خليفة ص٢٥٨، عبدالله بن الزبير، للخراشي ص١٣٥ .
٣ـ أنساب الأشراف (١/٤٠٠)، عبدالله بن الزبير ص١٣٤ .
٤ـ عبدالله بن الزبير ص١٣٤ .
٥ـ أريخ الطبري، نقلاً عن عبدالله بن الزبير ص١٣٦ .

* هەڵاتنی (عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد) بۆشام.
* کێبەرکێ ی هۆزو خێڵەکان لەسەر جڵەوی دەسەڵات.
* بەهێز بوونی (خەواریج)و هەڕەشەیان بۆ سەر هێمنایەتی.

ئەم هۆکارانەو هی تریش هانی عێراقیەکانیاندا خۆیان ڕێکخەن و بڕیاریان یەکخەن وبچنە ژێر ئاڵای (ئیبن زوبێر)ەوە.[1]

**٣ ــ بەیعەتی (ئیبن زوبێر) لەشام:**

دوا بەدوای مردنی (معاویەی کوڕی یەزید)، تەمتومان وتاریکایی کەش وهەوای شامی شێواندو ئاڵۆزی و جموجۆڵ ئەوێ ی گرتەوە، ئەمە هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ جێگیربوونی بەیعەتی (ئیبن زوبێر) لەشام دا، پێش ئەمەش: هەواڵی ئازایی و خۆڕاگریەکانی (ئیبن زوبێر) لەبەرامبەر پەلامارەکەی (حەسینی کوڕی نەمیر)و، بەیعەتی هەمە لایەنەی دانیشتوانی حیجاز بۆ ئەو لەشامدا بڵاوبونەوە، ناو ناوبانگیان بۆ دەرکردبوو.

(بلاوزي) هەڵوێستەکانی ئەوکاتی دانیشتوانی شامان بۆ بەیعەتدان بە(ئیبن زوبێر) بەم شێوەیە بۆ وێنا دەکات ودەڵێ: کاتێك (معاویەی کوڕی یەزید) مرد، زۆربەی خەڵك ڕوویان لە(ئیبن زوبێر)کرد، گوتیان: (ئەو پیاوێکی کامڵە لەژیری و تەمەندا، بەرگری لە(عوسمانی کوڕی عەففان)ی ئەمیری ئیمانداران کردووە، کوڕی پیاوە دڵسۆزەکەی پێغەمبەری خودایە ﷺ، دایکی کچی ئەبوبەکری صدیقە، ژمارەیەك سیفەتی بەرزو چاك لە زاتی ئەودا هەیە لەکەسی تر دانیە، خەریکە سەرچاوەکانی مێژوو کۆبن لەسەر بەیعەتپێدرانی لەلایەن هەموو هەرێمەکانی شامەوە، تەنها (ئەردەن) نەبێ، لەقونسرین: (زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی)[2] بەیعەتی پێدا، لەحمص: (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنساری)[3] بەیعەتی پێدا،

---

١ــ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٣٦ .
٢ــ الأعلام للزركلي (٣/٤٥) .
٣ــ هەمان سەرچاوە (٨/٣٦) .

لەفەلەستین: (نائیلی کوڕی قەیسی جوزامی)[١] توانی دەسەڵات پەیدا بکات وبانگەشەی خەڵك بکات بۆ بەیعەتی (ئیبن زوبێر).

لە دیمەشق: (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری)[٢] بەیعەتی پێدا، (ئیبن زوبێر) (زوحاکی کوڕی قەیسی) بەوالی شام[٣]دامەزراند.

ئەمە گرنگترین هەرێمەکانی شام بوون کەبەیعەتیان بە (ئیبن زوبێ)دا.

هەڵوێستی (خەواریج) بەرامبەر بەیعەتی (ئیبن زوبێر):

(خەواریج) تامردنی (یەزید) لەگەڵ (ئیبن زوبێر) هاوپەیمان بوون بۆ پارێزگاری کردنی (مەککە) کاتێك مەترسی لەسەر (مەککە) نەما، سەرکردەکەیان هاتە لای (ئیبن زوبێر)، تا بیروڕای ئەو وەربگرێت سەبارەت بە(عوسمانی کوڕی عەففان) ﷺ، بەشێوازێك وەلامی دانەوە کەپێیان ناخۆش بوو، بەو شێوەیەی بۆ وەسف کردن کەپێی وەسف دەکرا لە(ئیمان وبەڕاستدانانی و دادپەروەری وئیحسان و چاکەو ژیاننامەی خاوێن وپڕ لەچاکەو گەڕانەوە بۆ سەر هەق کە بۆی ڕوون ببوایەوە)، لەم کاتەدا لە(عبداللە) دوورکەوتنەوە و جودا بوونەوە وبڕیاریاندا بەرەو (عێراق)و (خۆراسان) بڕۆن، ڕۆیشتن ولەو شوێنانەدا بەلاشەیان وئاینیان ومەزەبیان و ڕێچکە جۆراو جۆرە بێ سەرو بەرەکانیانەوە بلاو بوونەوە، بەرنامەیان لق وپۆپی زۆرن ولەژمار نایەن و لەسەر بنەمای جەهل و هێزی هەواو ئارەزووی دەرون وبیروباوەڕی خراپ دامەزراون، لەگەڵ ئەمەشدا خۆیان لە زۆر ولاتدا سەپاند.[٤]

لەسەر داوا نامەیەکی (ئیبن زوبێر): سوار چاکی هیممەتدار وپاڵەوانی گەورە (موهەللەبی کوڕی ئەبی فرە) لە مەیدانی جەنگدا بەرەنگاریان بۆوە، سەرکردەی (خەواریج)ی ئەزاریقە: (نافیع ی کوڕی ئەزرەق) بوو، موهەللە توانی تێکیان بشکێنێ و(نافیع)ی سەرکردەشیان بکوژێت، خەواریج بەرەو (فارس) هەلاتن.[٥]

---

١ـ هەمان سەرچاوە (٣٤٣/٧) .

٢ـ الطبقات (٣٨/٥)، الأعلام (٢٤٤/٢) .

٣ـ أنساب الأشراف (١٣٢/٥)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٤١ .

٤ـ البداية والنهاية (٦٦٧/١١، ٦٦٨) .

٥ـ الأخبار الطوال ص٢٤٩، ٢٥٠ .

پڕوپاگەندەی کوژرانی (موهەللەب) گەیشتە (بصره)، شار شێوا، (حاریسی کوڕی ڕەبیعە)ی والی شار بڕیاری دا هەڵێت، موژدە دەر بەرەو (بصره) هات و ڕایگەیاند: (موهەللەب) ساغ و سەلامەتە، موژدەی سەرکەوتن بڵاوبۆوە وخەڵك ئارام بۆوە وشاریش ئاسایی بۆوە، والی (بصره) لەجێگای خۆی مایەوە تا (عبداللەی کوڕی زوبێر) هەواڵی نیازی هەڵاتنەکەی پێگەیشت، (عبدالله) (حاریسی) لەوالیایەتی خست وموسعەبی برای لەجێگەی ئەودا کردە والی، موصعەب: سەرپەرشتی ئیدارەی عێراق وفارس وئەهوازی دەکرد.

لەو هۆنراوانەی سەبارەت بەم جەنگە گوتراون وبە (موهەللەب)یان هەڵگوتووە:

إن رباً أنجى المهلب ذالطول     لأهل أن تحمدوه كثيراً

لايزال المهلب بن أبي صفرة     ماعاش بالعراق أميراً.[1]

اعیرێکی (خەواریج)یش ئاوای بە(نافیع) هەڵگو تووە:

إن مات غير مداهن في دينه     ومتى يمر بذكر نار يصعق

والموت أمر لامحالة واقع     من لايصحبه نهاراً يطرق

فلئن منينا بالمهب إنه     لأخو الحروب وليث أهل المشرق.[2]

---

١ـ الأخبار الطوال ص٢٥١ .

٢ـ هەمان سەرچاوە ص٢٥١ .

## باسی دووەم: دەرچوونی ( مەڕوانی کوڕی حەکەم ) لەدژی ( ئیبن زوبێر ).

### یەکەم: ناو وبنەچەکەی وژیانی پێش دەرچوونی لەدژی ئیبن زوبێر.

ناوی: مەڕوانی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبولعاسی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدوشەمسی کوڕی عەبدولمەنافە، مەلیك ئەبو عبدالملك ی قورەیشی ئومەوی[1]یە، ناسناوی: ئەبو لقاسم وئەبولحیکەمە، لە(مەککە) لەدایك بووە، بە(٤)مانگ لە(ئیبن زوبێر) بچوکترە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە: (عومەر وعوسمان و عەلی وزەید).

ئەم کەسانەش فەرموودەیان لەئەوەوە گێڕاوەتەوە: (سەهلی کوڕی سەعد، عورووە، عبیداللەی کوڕی عومەر، سعیدی کوڕی مسیب، علی کوڕی حسین، ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمن، مجاهدی کوڕی جبر، عبدالملك ی کوڕی مەڕوان).

کاتبی عوسمانی ئامۆزای بووەو، ڕۆژانی گەمارۆدرانی بەرگری لێکردووە، ڕۆژی (جەمەل) (عەلی) لەهەوالّی دەپرسیّ ودەلّیّ: (یعطفني علیه رحم ماسة)

لەگەلّ ئەمەدا یەکێك بووە لەسەر دەستەکانی لاوانی قورەیش[2]،داوای پیاوەتی و ئازایەتی فێلّ وزیرەکی و ئەزمون بووە[3]، لەسەردەمی (عومەر)دا قازی بووە.[4]

لەسەردەمی (معاویە)دا والی(مەدینە) بووە و(حەسەن وحوسەین) لەدوای ئەوەوە نوێژیان دەکردو نەیاندەگێڕانەوە.[5]

ئەگەر گرفتێك لەسەردەمی بەڕێوەبردنی مەدینەیدا بهاتایە پێش، هاوەلاّنی کۆدەکردنەوە پرسی چارەسەری پێدەکردن، دوو جامی پێوانەی هێنان و کامەیان ڕێکو پێك بوو ئەوەیانی پەسندکر، بەو جامە دەگوترا پێوانەی مەڕوان).[6]

---

١ـ سیر أعلام النبلاء (٣/٤٧٦) .
٢ـ هەمان سەرچاوە .
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ البدایة والنهایة، نقلاً عن العالم الأسلامي في العصر الأموي ص١٤٠ .

لەکتێبی (عن عثمان بن عفان ﷺ)دا کەمێك لەبەسەرهاتی ئەوم نووسیوە، خۆشەویستی زۆری بۆ (بەنی ئومەییە) هەبوو، زۆر بەتەنگ بەیعەتی (یەزیدی کوڕی معاویە)وە بوو، کاتێك (یەزید) مرد، (مەڕوان بەخۆی و خزمایەتی (بەنی ئومەییە) لەگەڵ سوپا گەڕاوەکەی شام لەگەمارۆی یەکەمی (مەککە) بەرەو شام ڕۆیشت، جێی باسە، ڕۆیشتنی (بەنی ئومەییە) لە(مەدینە) بەئارەزووی خۆیان بووە.[١]

(مەڕوان) بەیعەتی نەدا بە(ئیبن زوبێر)، سەرۆك هۆزەکان وخزمەکانی (بەنی ئومەییە)ی لەشام بوون لە دەوری هاڵان وبەیعەتیان پێدا، لەشان وشەپیلکی دا دیار بوو حەزی لەگەورایەتی و کوێخایەتییە، حەز بوون لەکوێخایەتی وحەزکردن بەمانەوەی خیلافەت لەبنەماڵەی (ئومەوی)دا دوو پاڵنەری سەرەکی ئەو بوون بۆ دەرچوونی لەدژی (ئیبن زوبێر)، باشترین بەڵگە لەسەر ئەمە: پێش مردنی دەستپێشخەریکرد لەوەرگرتنی بەیعەت بۆ (عبدالملك وعبدالعزین)ی کوڕی، کردنیە (وەلی عەهد)تا لەدوای خۆی جێی بگرنەوە،[٢] وەجاخی دەسەڵاتی ئومەوی کوێر نەبێتەوە.

بەپێی چەند گێڕانەوەیەك: (مەڕوانی کوڕی حەکەم) بڕیاریدا بەیعەت بدابە(ئیبن زوبێر)، بەڵام لەدواساتی بڕیارەکەیدا (عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد) و چەند کەسی تر لەو بڕیارەیان پاشگەز کردەوەو، قەناعەتیان پێکرد بانگەشە بۆ بەیعەتدان بۆ خۆی بکات.[٣]

هیچ بەدوور نازانرێ (مەڕوان) بیری لەمەکردبێتەوە؛ بەتایبەتی کاتێك بینیویەتی لەهەموو هەرێمەکانی سەرتاسەری وڵاتی ئیسلام بەیعەت دەدرێ بە(ئیبن زوبێر) و(بەنو ئومەییەش) لەوڵاتی شامدا بێ سەری ڕووی تێکردوون وپەرتەوازەو لاواز بوون ولەڕووی هەڵوێستەوە بێ هێز بوون، ئەمەی ئێستا خستمانە ڕوو لەگەڵ ئەوەی پێشدا گوتمان دژ نیە؛ چونکە حیساب لەسەر نیازو بڕیاری (مەڕوان) ناکرێ،

---

١ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٤٦ .
٢ـ الطبقات (٥/٢٢٦)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٥١ .
٣ـ الطبقات (٥/٤٠)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٥٢ .

بەڵکو حیساب لە ئەو هەڵوێستە کرداریە دەکرێ ناویەتی، کە لەڕەتکردنەوەی بەیعەتی ئیبن زوبێر وجەنگ لەگەڵ کردنی[1] و دەرچوون لەدژی دا خۆی دەردەخات.

## نەخشەی جەنگی ( مەڕوان ) لەدژی ( ئیبن زوبێر )

بەچەند هەنگاو جێبەجێکرا:

١ ــ لەنێو بردنی پشتیوان و هەوادارانی (ئیبن زوبێر) لەشام، لەگرنگترین ڕوداوەکانی شام کۆبوونەوەی (جابیە) و جەنگی (مەرج ڕاهیت) بوون.

٢ ـ گێڕانەوەی (مصر) بۆ ژێر حوکمی (ئومەوی).

٣ ـ هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی حیجازو عێراق.

٤ ـ دانانی (عبدالملك وعبدالعزیز) بە وەلی عەهد.

## دووەم: لە نێو بیردنی پشتیوانانی ( ئیبن زوبێر ) لەشام.

### گرنگی کۆبوونەوەی ( جابیە )، جەنگی ( مەراج ڕاهیت ).

پاش ئەوەی (مەڕوان) جڵەوی سەرکردایەتی ڕاپەڕینی ئومەوی لەدژی ئیبن زوبێر گرتە دەست، سەرەتا ڕیزەکانی یەکخستن و کەوتە ململانێ ی (ئیبن زوبێر)، یەکەمجار لەنێو (حیجاز)دا بەرەوڕوی نەچوو، بەڵکو پەنای بۆ سەندنەوەی هەرێمە دوورەکان برد، تا لەوێڕا دەسەڵاتی کەمکاتەوە پاشانیش لەنێو بردنی بۆ ئاسان بێت[2]، مەڕوان دوای پەیمانی کۆبوونەوەی (جابیە)ی خەڵکی شام بەڕەسمی چوو سەر حوکم، لەبەر گرنگی کۆبوونەوەی (جابیە)، کەمێك دەچینە سەر باسکردنی:

**١ ــ کۆبوونەوەی ( جابیە ):**

(ئەردەن)ی نیشتمانی (کەلەبیان) بەردەوام گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری حوکمی (بنەماڵەی ئومەوی) بوو، هەندێك لەسەرۆك هۆزەکانی شام داکۆکیان لەمانەوەی

---

١ـ عبدالله بن الزبیر للخراشي ص١٥٢ .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

پایتەختی خیلافەت لەشام وسنوور دارکردنی لەو وڵاتەدا دەکرد، بۆ وێنە: ئەوە (حەسینی کوڕی نەمیر)ەو پێشنیاری خیلافەت بۆ (ئیبن زوبێر) دەکات بەمەرجێك بێتە شام، وەك دەردەکەوێ سەرانی شام لەخۆڕایی وبێ پاساو داوای مانەوەی مەڵبەندی خیلافەتیان لە(دیمەشق)دا نەکردووە، بەڵکو پشتئەستوور بوون بەبەڵگەوە، ڕۆژگار حەقیقەتی داواکەیانی سەلماندووە؛ کە خەڵکی شام توانای یەکلایی کردنەوەی گۆڕانکاریەکانی مێژوویان تێدا هەیە؛ دیارە بەهۆی پتەوی و بەهێزی ڕەگ وریشەی یەکێتی هۆزە یەمەنیەکانی شام وبوونی دەوڵەتی ئومەوی لەو وڵاتەدا.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم یەکێتیە پتەوەی هۆزەکانی شام توشی ڕاتەکاندنێکی گەورەو پەرتەوازەیەکی سامناك بوو، بەجۆرێك ڕووداوە سیاسیە خێراکانی ئەوکات ململانێیەکی توندیان لەنێوان هۆزەکانی (قەیسی ویەمانی) دا دروست کرد، کە لە دواخۆیەوە بەردەوام کاردانەوەی خراپی لەسەر ژیانی سیاسی دروست دەکرد.

قەیسیەکان: لەم قۆناغەدا و لەباکووری شام، بەیعەتیان بەتاکە هەڵبژاردەی دەرکەوتوو وسەرکەوتووی پەسندکراو (عبداللەی کوڕی زوبێر)دا، کاتێك (زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری) هاتە نێویانەوە زیاتر پشتئەستوور بوون، قەیس کەسێك بوو ژیانی لە خزمەت (معاویەو یەزیدی کوڕی) بەسەر برد بوو، ئێستاش دوای مردنی (معاویەی دووەم) کاربەڕێوەبەری(دیمەشق)ە.

بەڵام کەلەبیەکان: هەرچەندە بەڕواڵەت هەڵوێستیان کزولاواز بوو لەنێو بەیعەتی بەکۆمەڵی خەڵکی شام بەگشتی وبرایانی باکوریان بەگشتی بۆ (ئیبن زوبێر)، ئەوان لەسەر پەیمانی پێشداو وابەستەییان بۆ (بەنی ئومەییە) مایەوە؛ چونکە ژن و ژنخوازی لەنێوان ئەوان و ئومەویەکاندا دروست ببوو معاویە ببوە زاوایان و[1] (یەزید)یش لە نێویاندا گەورە ببوو.[2]

---

١ــ تأريخ الطبري (٢٤٦/٦) .

٢ــ هەمان سەرچاوە .

بەڵام دوای ئەمە لەنێو خۆدا ڕایان جیاواز بووە لەسەر ئەوە بەیعەت بەکێ بدەن، هەندێکیان ڕایان لەسەر (خالیدی کوڕی یەزید) بوو، کە خالید مێرد منداڵ بوو، هەندێکی تریشیان لەبەیعەتدان بەمنداڵێکی وەك خالید پاشە کشەیان دەکرد، لە کاتێکدا خەڵکان بەگشتی ڕایان لەسەر بەیعەتدان بەپیاو ماقوڵ و پیری قورەیش (عبداللەی کوڕی زوبێر) بوو، ئەوا ئەو کۆمەڵەی دووەمی کەلەبیان ڕایان لەسەر (مەڕوان کوڕی حەکەم) بوو، بەلای ئەوانەوە (مەڕوان) لە (عبداللە) باشترو لە پێشترو شایانترە.

دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر بۆ چاکردنەوەی نێوانی (قەیسی ویەمانی)، هەردولا ڕێکەوتن لەسەر کۆبوونەوە لە(جابیة)[1] بە مەبەستی ڕاوێژکردن وڕێکەوتن لەسەر مەسەلەی بەیعەت، کەلەبی وئومەویەکان بەرە و(جابیە) بەڕێکەوتن، لەو کاتەدا هەندێك لەپشتیوانانی ئیبن زوبێر زوحاکی کوڕی قەیسیان) وادارکرد گوێڕایەڵیان بێت وئەویش لەگەڵیان کەوت وبەرەو (مەرج ڕاهیت)[2] بەڕێکەوت.

ا ـ پەیڕەو کردنی شوڕا لە کۆبوونەوەی (جابیە):

کەلەبیەکان کۆنگرەی خۆیان لە(جابیە) بەست، سەبارەت بەبەیعەتی خیلافەت ڕاوێژیان کرد، کۆنگرەی (جابیە) کۆبوونەوەیەکی مێژوویی یە، دەکرێ بەزمانی سیاسی وەسف بکرێت و ناوی (کۆنگرەی دەستوری) لێ بنرێ، پیاو ماقوڵ وقسە ڕۆیشتو و خاوەن هێزی شام تێیدا بەشداربوون، لەم کۆنگرەیەدا داوەتی خەڵکی خاوەن ڕاو چارەسەرسازی بۆ کرابوو، کە بەئازادانە بیرو ڕای خۆیان دەربڕن، دەتوانین تەماشای لایەنێکی ئەم ئەزموونە ڕاوێژکاریە سەرکەوتووە بکەین؛ دەبینین ژمارەیەك ناوی تێدا هاتونەتە بەرباس ولێکۆڵینەوە بۆ پۆستی خیلافەت، کە ئەمانە لەدەرەوەی بنەماڵەی (بەنی ئومەییە) بوون، بەڵام دەرەنجام تاتەرازووی (مەڕوان) سەرکەوت، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێك: وەك (روحی کوڕی زنباعی جوزامی)یەك

---

١ـ الجابیة: شارۆچکەیەکی سەریە دیمەشق بەلای جۆلانەوە .

٢ـ تأریخ الطبري، نقلاً عن الدولة الأمویة المفتری علیها ص٢٦٦ .

لەسەرانی شام باسی دەکات، کاتێك لەکۆنگرەکەدا گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە، کە دەڵێن: (عبداللەی کوڕی عومەر) هاوەڵی پێغەمبەری خودایەﷺو مێژوویەکی پێشینەو دێرینی هەیە لەئیسلامەتی دا، بەلام (ئیبن عومەر) پیاوێکی لاوازە، کاروباری ئۆممەتی(محمد)ﷺ بەپیاوی لاواز بەڕێوە نابرێ.

بەلام ئەوەی خەلك باسی دەکات دەربارەی (عبداللەی کوڕی زوبێر)کە پیاوێکی بەتواناو دەسەلاتە، بەخوا ئەوەی دەیلێن ئاوایە، ئەو کوڕی (زوبێر)ە، کە زوبێر (دڵسۆز)ی پێغەمبەری خودا بوو، ئەو کوڕی (ئەسماء)یە کە ئەویش کچی (ئەبوبەکری صدیقە)و بە(خاوەن دوپشتێن) بەناوبانگە، دەڵێن: (ئیبن زوبێر) مێژوویەکی دێرینی هەیە لەچاکەو ئیسلامەتیدا، بەڵێ وایە، بەلام (ئیبن زوبێر): مونافیق ودوو ڕووە، دوو خەلیفەی لە خەلیفایەتی خستوون، واتە (یەزیدو معاویە)ی کوڕی، یاخی بووەو خوێنی موسڵمانانی ڕشتووە، مونافیق و دووڕوو نابێتە خاوەنی کاروبارو دەسەلاتی موسڵمانان، بەلام (مەڕوانی کوڕی حەکەم) بەخوا هەرکات بەهۆی ناکۆکی ودووبەرەکی کەلێنێك دروست بووبێ لەنێو موسڵماناندا، ئەو وەستایانە پڕی کردۆتەوەو بۆیەکی هێناوەتەوە، ئبن زوبێر بەرگری لەئەمیری ئیمانداران (عوسمانی کوڕی عەففان) کردووە لەڕۆژانی گەمارۆدرانیدا، شەڕی لەدژی (عەلی کوڕی ئەبیتالیب) کردووە لەڕۆژی (جمل)دا، ئێمە پێمان باشە بۆ خەلك بەیعەت بەپیاوە بەتەمەنەکە - مروان - بداو چاوەڕێ ی گەورەبوونی مێر منداڵەکە - خالید - بێ، ئینجا ڕاکان کۆك بوون لەسەر بەیعەتدان بە(مەڕوان)، دوای ئەو بۆ (خالیدی کوڕی یەزید)، ئینجا بۆ (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص.[١]

ئەم هاوکێشە ڕاجیاوازەکانی یەکخستن و هەموو لایەنەکانی قایل کرد.[٢]

گفتوگۆی نێو کۆبوونەوەکە زۆری خایاند، ژمارەیەك سەرەك هۆزی بەرچاوی شام وسەرانی (بەنی ئومەییە) ئامادەیبوون، لەو کەسایەتیە دیارانە: حیسابی کوڕی مالیکی حەدەلی کەلبی، حەسینی کوڕی نەمیری سکونی، ڕوحی کوڕی زنباعی

١ـ تأريخ الطبري (٦/٤٧٢) .

٢ـ الدولة الأموية المفترى عليها ص٢٩٦ .

جوزامی[١]، مالیکی کوڕی هەبیرەی سکونی، عبداللەی کوڕی مەسعەدەی فەزاری، عبداللەی کوڕی عوزاتی ئەشعەری و ژمارەیەکی تریش لەکەسە کاریگەرەکانی[٢]دژیە (ئیبن زوبێر)، بیروڕای زۆر ئاڵوگۆڕ کران، تاڕای هەموان لەسەر (مەڕوان) قەراری گرت.[٣]

مەڕوان درێغی نەکرد لەبەخشینی ئیمتیازاتی پایەو سامان بۆ هۆزەکانی (کەلب و کیندە) تا بەلای خۆیاندا ڕاکێشێ، ئەو بەنهێنی لەگەڵ هەموو ئەو سەرۆك هۆزانە ڕێکەوتبوو کەکاریگەریان هەیە لەسەر جەماوەرو ڕاکێشان و کۆکردنەوەیان لەدەورەی ئەو وپشتیوانیکردنی، نەخشەی داڕشت وتوانی لەچەند ڕێگەی جۆراوجۆرەوە خۆی بگەیەنێتە سەر تەختی حوکمڕانی لەشام وبەسەر هەموو ئاستەنگەکاندا زاڵ ببێ.[٤]

**ب ــ بڕیارە هەرە گرنگەکانی کۆبوونەوەی( جابیە ):**

بڕیارە هەرە گرنگەکانی کۆبوونەوەی(جابیە) لەم چەند ڕستەدا کۆدەبنەوە:
بەیعەت نەدان بە(ئیبن زوبێر).
دوور خستنەوەی (خالیدی کوڕی یەزید) لەبەیعەت؛ بەپاساوی ئەوە عەرەب حەزناکات بەیعەت بەمنداڵ بدات، بە تایبەت لەم کاتەدا، کە لەنێو کێشەو تەنگژەدان.
کەواتە ئەوان پێویستیان بەمێردەزمەیەکی شارەزایە پێشڕەوایەتی یان بکات بەرەو سەرکەوتن ولەم بارە ناهەموارە ڕزگاریان بکات.
بەیعەتدان بە(مەڕوانی کوڕی حەکەم)ی پیری کامڵی ژیر، دوای گۆنگرە: دەبێ (کەڕوان) جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت وخۆی سازو باز بکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شوێنکەوتوانی(ئیبن زوبێر)، ئەم کارە لە (شام) ڕا دەستی پێ دەکرێت.[٥]

---

١ــ تأريخ الطبري (٤٧٢/٦) .
٢ــ عبدالله بن الزبير للخراشي ص١٤٧ .
٣ــ تأريخ الطبري (٤٧١/٦،٤٧٢) .
٤ــ الدور السياسي لأهل يمن في الشام، إسماعيل الجبوري ص٤٦،٤٧ .
٥ــ عبدالله بن الزبير للناطور ص١٣٢ .

**ج ــ بەپێی ڕاوێژ (مەڕوان) سەرکردایەتی بەرەنگاربوونەوەی (ئیبن زوبێر) دەکات:**

سەرکردایەتی کردنی هێزی موعارەزە لەلایەن (مەڕوان)ەوە لەسەر بنەمای ڕاوێژ وەستابوو؛ چونکە ئەو بە شێوازێکی ئازاد لەلایەن ئامادەبوانی کۆبوونەوەکە دیاریکرا، ئامادەبوان بریتی بوون لەخەڵکانی سەرکردەو چارەسەر سازو خاوەن بڕیاری شام، بەڕێگەی دەستوری یەکدەنگ بوون لەسەر (مەڕوان)، بەم جۆرە لەم کات وساتەدا جیهانی ئیسلام دوو خەلیفەی هەبوو:

یەکەمیان: عبداللەی کوڕی زوبێر خەلیفەی شەرعی وهەڵبژێردراو لەلایەن زۆرینەی ئوممەتی ئیسلامی.

دووەمیان: مەڕوانی کوڕی حەکەم سەرکردەی هێزی موعارەزە وبەرهەڵستکاری دژبە (ئیبن زوبێر) هەڵبژێردراو لەلایەن خاوەن هێزو بڕیار بەدەستانی پایتەختی خیلافەتی (ئومەوی).

لەکاتێکدا یەکبوونی دەوڵەت ویەکبڕیاری موسڵمانان یەکێکە لەواجبەکانی ئیسلام؛ بۆیەو لەپێناوی ئەم ئامانجەدا دەبێ یەکێك لەم دوو خەلیفەیە زاڵبێ بەسەر ئەوی تریاندا، بەڵێ ئاگری شەڕ هەڵایساو درێژەی کێشا تا کار بەوە گەیشت(عبداللەی کوڕی زوبێر)ی خەلیفەی شەرعی کوژراو کاروباری دەوڵەت بۆ(عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) بەرقەرار بوو.

دیارە خەڵکی شام ئەوانەی دژایەتی (ئیبن زوبێر)یان کردو لە(جابیە) کۆبوونەوە ڕایان وابوو: بەیعەتدانی خاوەن هێزو بڕیار بەدەستانی پایتەختی خیلافەت حوکمەکەی بەسەر تەواوی هەرێم وشارەکاندا پەخش دەبێ وواجب دەبێ لەسەریان: گوێڕایەڵ وفەرمانبەرداری ئەو کەسەبن، کەئەوان بەیعەتیان داوەتێ، بەمەش دەوڵەت دەبێتەوە بەیەك ولە جیاوازی ڕاکان وڕزگاری دەبێت.[١]

(إبن حزم): ئەم ڕایەی داوەتە پاڵ خەڵکی شام ودەڵێ: ئەوان بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندیەکانیان ئەم فتوایەیان داو وای لێکردن بەیعەت بە(مەڕوان)و پاشان

---

١ــ الأحكام السلطانية للماوردي ص٦ .

(عبدالملك)ی کوڕی بدەن، بەم شێوەیە ڕژانی خوێنی موسڵمانانیان حەڵا کرد.[١]

بەنیسبەت (بەیعەتی ئیبن زوبێر)، پابەند بوون بوو بەڕای زۆرینە، ئەگەرچی بەڵگەی جێگیربوونی بەیعەتی خەڵکی پایتەختی (خیلافەت) یاسایەك بوو، بەیعەتی صدیق و فاروق و ذو النورین و علي و حسن کوڕی علی لەسەر بنیات نرابوو، بەڵام کاروبارەکان گۆڕانکاری زۆرو گەورەیان بەسەردا هاتبوو.

پابەند بوون بەیاسای زۆرینە: لەحاڵەتی کێشە کێشدا پەسند دەکرێت، ئەمە ئیمامی (غەزالی) بڕیاری لەسەر دەدات ودەڵێ : کێ بەیعەتی زیاتری پێدرابێت بەسەر ئەوانی تردا هەڵدەبژێرریت، بەر هەڵستکاری ڕای زۆرینە دەرچووی سنووری شەرعە، واجبە بەرەو هەق وفەرمانبەرداری بگێڕدرێتەوە.[٢]

ئێمە پشتگیری ئەم ڕایە دەکەین؛ چونکە ڕای زۆرینەی موسڵمانان بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشەو ناکۆکیەکان وەردەگیرێت وئەنجامگیری لەسەر دەکرێت، ئەم شێوازە یاسای مافی ئوممەتی ئیسلامی دەسەلمێنێ بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و خەلیفەیەك بۆ خۆی[٣] و لەهەر سەردەمێکدابێ.

جگە لەمە بەڵگەی زۆرو زەوەند هەیە لەسەر پەسندکردنی ڕای زۆرینە، لەو بەڵگە شەرعیانە: پێغەمبەرﷺ خودی خۆی پابەندی بڕیارێك بووە کەڕای زۆرینەی هاوەڵانی لەسەر بووە، ئەگەرچی پێچەوانەی ڕای ئەویش بووبێ، کاتێك هەواڵی هێرشی قورەیشیەکانی بیست بۆ سەر شاری مەدینە، ڕاوێژی بەهاوەڵانی کرد، کۆمەڵێك کەئەوان زۆرینە بوون ڕایان لەسەر چوونە دەرەوە بوو بۆیان، ڕای کۆمەڵەکەی تر ڕای پێغەمبەریان هەبوو، کەچاك وایە لەشاردا سەنگەریان لێبگرن، کاتێك پێغەمبەرﷺ بینی زۆربەی هاوەڵان ڕایان لەسەر چوونە دەرەوەیە، کاری بەڕای ئەوان کردو بڕیاریدا لەکێوی (ئوحود) بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە.[٤]

---

١ـ الفصل الأول في الملل والنحل (١٦٨/٤) .

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ نظام الحكم في الأسلام، د.أحمد عبدالله ص١٣١ .

٤ـ المرجع السابق ص١٣١ .

پرۆژەی (الدستوری الإسلامي)ی ئامادەکراو لەلایەن (مجمع البحوث الأسلامية) و (الأزهـر)، ئـەنجامی ڕای زۆرینـەی پێویـست کـردوو، ماددەی(٤٦) ئاوایـە: بەیعـەت بەزۆرینەی دەنگی بەشداران دادەمزرێت.[١]

**٢ ـ جەنگی (مرج راهط):**

کۆنگرەی (جابیە) (خیلافەتی ئومەوی) لەنێو ماڵی (سوفیانی)یەوە بۆ نێو ماڵی (مـەڕوانی) گواسـتەوە، دەسـتی بەیعەتـدان بـۆ (مـەڕوان) درێـژکرا، بـەم شـێوەیە کۆنگرەکـە چارەسـەری کێـشەی خیلافـەتی لـەنێو (بـەنی ئومەییـە)دا کـرد، ئەمـە هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە بوو، بەڵام بەرقەرار کردنی ئەم دەسەڵات وخیلافەتە هەروا ئاسـان نیـەو ئاسـتەنگی گـەورەی لەبەردەمـدا دروسـت بـوون، (زوحـاکی کـوڕی قەیسی)ی سەرۆکی قەیسیەکانی پشتیوانی (ئیبن زوبێـر)و لەگـەڵ (نوعمـانی کـوڕی بەشـیری ئەنـساری)ی والی (حمـص)و (زوفـەری کـوڕی حاریـسی کیلابـی)ی والی (قینسرین) لە(مرج راهط) کۆبوونەوە وخۆیان ئامادەو تـەییار کـردووە بـۆ بـەرەنگار بوونەوەی (ئومەویەکان)، ئێستا (مەڕوان) لەسەریەتی بیسەلمێنێ: کە ئـەو شـایانی بەرپرسیارێتی و هەڵگرتنی باری قورسی (خیلافەت)و بەرگریلێکردنیەتی.

سـەرەتا لەدیمەشـقی پایتـەختی خیلافەتـەوە دەسـتبەکار بـوو، پـشتیوانانی (مـەڕوان) توانیـان پـەلاماری (دیمەشـق) بـدەن و دەسـتیان بەسـەر داگرتـەوەو کاربەدەستی (زوحاک)یان بەدەرێنا، بەقسەی (إبن الأثیر):

ئەمە یەکەم سەرکەوتنی (بەنی ئومەییە) بوو.[٢]

مەڕوان کـاتی بەفیرۆنـەدا سـوپایەکی لـەهۆزەکانی یـەمانی نیـشتەجێ لەشـام (کەلب وغەسان وسکون) ساز کرد، عەمری کوڕی سەعیدی لەلای ڕاستی سوپاکەوە دانا، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادی لەلای چەپی سوپاکەوە دانـا، بـەرەو (مـرج راهـط) بەڕێکەوت، جەنگ ڕوویداو ئەنجامەکەی یەکلایی کردنـەوەی هەڵوێـستی شـامی تێـدا

١ـ نحو دستور إسلامي، محمد سيد أحمد، ص١٧٣، نظام الحكم في الأسلام، د. أحمد عبدالله ص١٣٢ .
٢ـ الكامل لإبن الأثير (٦١٨/٢) .

بوو بۆ (بەنی ئومەییە)؛ چونکە قەیسیەکانی پشتیوانی (ئیبن زوبێر) تێکشکان، (زوحاکی کوڕی قەیس)و ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەو پیاو ماقوڵانی (قەیس)ی نێو شام کوژران، جەنگەکە (٢٠) ڕۆژی خایاند، ئەم ڕووداوە لەکۆتایی ساڵی ٦٤ی کۆچیدا بوو، دەشگوترێ لە موحەڕڕەمی ٦٥ی ك دابووە.[1]

**أ ـ ئەنجامەکانی جەنگی (مرج راهط):**

ـ دەسەڵاتی (بەنی ئومەییەی) لەمەترسی لەنێو چوون ڕزگار کردو دەسەڵاتی لەباڵی (سوفیانی)یەوە گواستەوە بۆ باڵێ (مەڕوانی).

ـ ئومەویەکانی ڕزگار کرد لە(زوحاکی کوڕی قەیسی فەهری)ی گەورە پشتیوانی دڵسۆزی (ئیبن زوبێر).

ـ (قنسرین) کەوتە ژێر ڕکێفی ئومەویەکان وزوفەری کوڕی حاریسی سەرکاری بەرەو (قرقیسیا) ڕۆیشت، بەپێ ی قسەی (إبن الأثیر): (عیازی حەرسی) کاربەڕێوەبەری بووە.

ـ (فەلەستین) کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئومەوی و(ناتلی کوڕی قەیسی جوزامی)ی کاربەڕێوەبەری بۆلای (ئیبن زوبێر) ڕۆیشت.

ـ (حمص) گیراو (نوعمانی کوڕی بەشیر)ی کاربەڕێوەبەری کوژرا.[2]

ـ بەرپابوونی ململانێ ی نێوان یەمانی وقەیسی، بەمە دەمارگیری خێڵەکی خۆی خزاندە نێو مەیدانی سیاسەتی باڵای دەوڵەت، ئەگەر چی جەنگی (مرج راهط) سەرکەوتنی کەلبیەکانی بەدەستهێنا، بەڵام ئەمە سەرکەوتنێکی کاتی بوو، ململانێی بەردەوامی دوو ڕەگەزی قەیسی ویەمانی یەکێك بوو لەهۆسەرەکیەکانی ڕووخانی دەوڵەتی ئومەوی.[3]

---

١ـ تأريخ الطبري (٤٧٣/٦)، العالم الإسلامي في العصر الأموي ص١٤٣ .
٢ـ الكامل لابن الأثير (٦١٨/٢)، إبن الزبير للناطور ص١٣٧ .
٣ـ تأريخ خلافة بني أمية، نبية عاقل ص١٣٠ .

**ب ــ هۆكارەكانی تێكشكانی (قەیسیەكان):**

- (ئیبن زوبێر) بەقورسایی پێویستەوە نەچووە نێو ئەو جەنگەوە[4] دەبوایە سوپایەكی جەربەزەی بە چەكوچۆڵی تەواوەوە بۆ پشتیوانی لایەنگرانی ناردبایە، بەتایبەتی كەدەیبینی نەیارانی شامی ئێستا پەرتەوازەن ویەكیان نەگرتۆتەوە.

ــ پشبەستنی (مەڕوان) لەوجەنگەدا بەپیاوانی شارەزاو بەئەزمونی شەڕوپێكدادان، وێنەی: (حەسینی كوڕی نەمیری سكوفی، عەمری كوڕی سەعید).

- تەواوی لایەنگرانی (ئیبن زوبێر) ئامادەی جەنگەكە نەبوون، بەڵكو والیەكانی بەخۆو ژمارەیەكی كەمی سەربازیەوە چوو بوونە نێو جەنگەكەوە.

ــ (زوحاكی كوڕی قەیس) لەكاتی بەجێهێشتنی شاری (دیمەشق) نەهات هێزێكی گەورەی تێدا بەجێ بێڵێ تا پارێزگاری كردنی ئەم شارە گرنگە دەستەبەر بكات، ئومەویەكان ئەم هەلەیان قۆستەوەو بەئاسانی دەستیان بەسەر (دیمەشق)دا گرت.[1]

**ج ــ گریانی مەڕوان لە(مرج راهط):**

گێڕدراوەتەوە: كاتێك سەری (زوحاكیان) بۆلای مەڕوان هێنا، ناڕەحەت بوو و گوتی: ئێستا كە تەمەنم بەرەو ژوور چووە وئێسكم باریك بووە و بەئەندازەی ماوەی تێنوێتی گوێدرێژێكم تەمەن ماوە[2] و خەڵك دێنم وپێكیان وەردەكەم![3]، هەروەها دەگێڕنەوە: لەو ڕۆژەدا گریاوەو سەری لەقالان وەرێناوەو[4] گوتوویەتی: پاش ئەوەی پیر بووم و لاواز بووم، وام لێهات لەسەر دەسەلات شەڕە شیر بكەم![5]، لەگێڕانەوەیەكی دا (مالك)، گوتوویەتی: (مەڕوان) گوتی: ماوەی (٤٠)ساڵە قورئان دەخوێنمەوە، ئێستا خۆم لەنێو مەیدانی خوێنڕێژی و جەنگو هەرادا دەبینمەوە ![6].

---

١ـ عبدالله بن الزبير للناظور، ص١٣٨ .
٢ـ تأريخ الطبري (٤٧٤/٦) .
٣ـ هەمان سەرچاوە .
٤ـ البداية والنهاية (٦٧٦/١١) .
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ سير أعلام النبلاء (٤٧٩/٣) .

پەشیمان بوونەوەی (مەڕوان) لەم ساتە وەختەدا کەسەرکەوتنی بەدەستهێناوەو سەبارەت بەگرتنی جڵەوی دەسەڵات دڵنیا بووە وڕێگەکانی گەیشتن بەئامانجەکانی بۆ خۆشبوون، بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر هەبوونی بزوێنەرێکی خێر کە دڵی مەڕوان بەم شێوەیە دەجۆشێنێ، لەکاتێکدا کە دەبوایە ئەم سەرکەوتنە هەموو تاڵی و ناخۆشیەکانی ژیانی لەبیر بەرێتەوە، دەبوایە دەستکەوتی پۆستی حوکمڕانی هەموو هۆکارەکانی پەشیمانی وتێکدەرەکانی کەش وهەوای سافی لەئاسمانی خەیاڵیدا لێ بڕەوێنێتەوە، بەڵام حاڵی مەڕوان حاڵی پەشیمانی یە، حاڵێك کەتێی کەوتووە، حاڵەتی پەژارە و خەفەت ومەراق لەدڵو دەروون دەر دەکات و، حاڵەتی پەشیمانی لەکەسێك دوور دەخاتەوە کەتا دوێنێ داوای موڵك و سەڵتەنەتی کردووە وئەمڕۆش پێ ی گەیشتووە !.[1]

زۆربەی ڕا لەسەر ئەوەن، کە کەسانێك مەڕوانیان تووشی ئەم داواکاریە ناڕەوایە کردو پاڵیان پێوەناو خستیانە نێو ئەم زەلکاوە بۆگەنە، خەڵکانێك بوون خوازیاری بەرژەوەندی دنیایی بوون وبەس؛ بۆیە مەڕوان لەوکاتەدا هەستی بەمەکردو ویژدانی کەوتە ژان و ترسا پیری ناخیرشەڕ بێ، بەتایبەتیش کەبینی هەردوك دەستی لەپێناو باتاڵی ڕزیوی دنیادا بەخوێنی موسڵمانان سوور بوون.

## سێهەم: گرتنەوەی (میسر) و هەوڵی گرتنەوەی ( عێراق و حیجاز).

جەنگی ( مەرج ڕاهیت) ئەنجامی جێگیر بوونی دەوڵەتی (مەڕوان)ی ئومەوی لە شامدا لێکەوتەوە، ئینجا (مەڕوان) بەرەو (میسر) هەنگاوی نا، بەم هەنگاوەی زیرەکی خۆی سەلماند: چونکە میسر لەگەڵ ئەوەدا وڵاتێکی گرنگە، ئەوا بە سەرکەوتنی لە شوێنێکی ئەوادا هێز و پێزی زیاتر دەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەکانی لەگەڵ (ئیبن زوبێر)دا، زاڵبوونی بەسەر (میسر)دا کارێکی قورس نەبوو، چونکە میسریەکان هەواداری دەوڵەتی (بەنی ئومەییە) بوون، کە بەیعەتیشیان بە (ئیبن زوبێر)دا لەگەڵ دڵسۆزیانەوە نەبوو، بەڵکو لە ڕووی ناچاری بوو[2].

---

١ـ الأمويون، محمد الوكيل (١/٣٠٧) .

٢ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي ص:١٤٤.

پێش ئەوەی دەست بە هێرشەکەی بکات لایەنگرانی (بەنی ئومەییە)ی میسری بە نهێنی بانگکرد،[١] ئەمە ڕێخۆشکەرێکی سەرەکی بوو تا بە ئاسانی ئەو وڵاتە بگرێت، خودی خۆی سەرکردایەتی سوپا هێرش بەرەکەی کرد، (عەمری کوڕی سەعید و خالیدی کوڕی یەزید و حەسانی کوڕی مالیك و مالیکی کوڕی هەبیرە و عبدالعزیزی کوڕی) لەگەڵدابوو،[٢] چەند شەڕ و پێکدادانێك لە نێوان (مەڕوان) و (ئیبن جەحدەم) دا ڕوویاندا، (مەڕوان) سەرکەوت و (ئیبن جەحدەم) هەڵات، پاشان هاتەوە لای (مەڕوان) و داوای لێکرد لێی ببورێ و ڕێگەی پێ بدات بەرەو (مکە) دەربچێ، ئەویش لێی خۆش بوو و ڕێگەیدا.

ئەمە و لە جەمادی دووەمی ٦٥ك دا مەڕوان میسری گێڕایەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئومەوی.[٣] ماوەی (٢) مانگ بە مەبەستی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخ و ڕێکوپێك کردنی دەوڵەت لە(میسر) دا مایەوە، کاتێك ویستی بگەڕێتەوە شام (عبدالعزیز)ی کوڕی بە (والی) لەو وڵاتەدا دیاریکرد، وەستێکی وای کرد، کە بەڵگە بێ لەسەر سیاسەتی بەهێزی و شارەزایی زۆری، (عبدالعزیز) کە بینی بە تەنها لە میسر بەجێ دەمێنێ ترس و دڵە ڕاوکەی لەسەر دروست بوو، بە مەڕوانی باوکی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران نیشتەجێبوون لە وڵاتێکدا چۆنە کە کەسێکی خانەوادەی (بەنی ئومەییە)ی لێنەبێ؟! مەڕوان پێی گوت: ڕۆڵەکەم: با چاکە کردن و خێروبێری گشتیان بگرێتەوە، هەموویان دەبن بە کوڕی بابت، با سەروڕووت خۆش بێ لەگەڵیاندا هەموویان دەبنە خۆشەویستت، هەر کامێك لە سەرکردەکانیان وا حاڵی بکە کە ئەو تایبەتە بە خۆتەوە، دەبێتە چاودێر بەسەر ئەوانی ترەوە و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری هۆکەشی بۆ تۆ مسۆگەر دەکات، (بیشر)ی برات لەلا بەجێدێڵم، تا وەڕەزی خۆتی پێ بشکێنی، (موسای کوڕی نەسیر)م بۆ کردیە وەزیرو ڕاوێژکار، جگە لە ئەمیرایەتی کردنی ئەم وڵاتە هیچی ترت لە ئەستۆدا نیە، ئایا ئەمە باشتر نیە بۆ تۆ لە خۆ تەمبەڵکردنی نێو ماڵ و داخستنی دەرگای

---

١ـ الولاة و القضاء الکندي ص:٤٢،٤١.

٢ـ هەمان سەرچاوە:٤٢.

٣ـ هەمان سەرچاوە ص: ٤١، العالم الاسلامي في العصر الاموي ص:١٤٤.

خانووت؟[١] (مەڕوانی کوڕی حەکەم) لە ڕێگای گەڕانەوەی میسرپیدا، دوو هێزی سەربازی هێرشبەری ئامادەکردن بۆ سەر عێراق و حیجاز، هێرشەکەی سەر (عێراق) بە سەرکردایەتی (عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد) بوو، نەخشەی هێرشەکەی بە گەمارۆدانی (زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی) و خۆقوتارکردن لە مەترسی ئەو لە (قەرقیسیا) دەستی پێ دەکرد، ئینجا بەرەو عێراق و بەرەنگار بوونەوەی موسعەبی کوڕی زوبێر دەچێت، بەلام ئەم هێرشە لە سەردەمی (مەڕوان)دا هیچ ئامانجێکی نەپێکا، کاتێك سوپا لە ڕێگەی هێرشی (قرقیسیا) و گەمارۆدانی (زوفەر)دا بوو ئەجەل گەیشتە سەری و مرد.

کاتێك عبدالملك هاتە سەر حوکم، بڕیار درا هێرشەکە بکرێت، کە لە لاپەڕەکانی دوایەدا باسی لێوە دەکەین.

بەلام دەربارەی هێرشەکەی سەر (حیجان): (مەڕوان) سوپایەکی (٦٤٠٠) سوارەی بە سەرکردایەتی (حوبەیشی کوڕی دەلجەتولقینی) لە فەلەستین ڕا بەرەو ئەوێ بەڕێکرد، (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) بە خۆی و باببیەوە لە ڕیزی سوپاکەدا بوو، کە سوپا گەیشتە (وادي القرى) کاربەدەستی ئیبن زوبێر لە (مەدینە) ڕایکرد،[٢] هێرشەکە تا سەردەمی عبدالملك بەردەوام بوو.[٣]

## چوارەم: کرانی عبدالملك بە والی عەهد و مردنی مەڕوان:

مەڕوانی کوڕی حەکەم (٢) مانگ پێش مردنی دواین کاری سیاسی خۆی بە بەستنی بەیعەت بۆ عبدالملك و عبدالعزیزی کوڕی ئەنجامدا، بەم شێوەی یاسای بە میراتگرتنی دەسەلاتی لە ئیسلامدا بەرجەستەکرد.[٤]

دوا بەدوای گەڕانەوەی لە (مصر) پیلانی دانا بۆ:

دوورخستنەوەی خالیدی کوڕی یەزید و عەمری کوڕی سەعیدی ئەشرەق لە پۆستی دەسەلات ئەم دوو کەسە لە کۆنگرەی جابیە بڕیاریان بۆ درا بوو دوا بە

١ ـ الولاة و القضاء ص:٤٧.
٢ ـ أنساب الاشراف(٥/١٥٠،١٥١)، الدور السياسي لأهل اليمن ص:٥٧.
٣ ـ الدور السياسي لأهل اليمن ص:٥٧، عبدالملك بن مروان لضياء الدين الريس ص:٦٠.
٤ ـ تأريخ خليفة نقلاً عن عبدالملك بن مروان للريس ص:٦٠.

دوای مەڕوان حوکم بگرنە دەست، دایکی خالیدی مارە کردەوە، حەسانی کوڕی مالیکی کوڕی بەجدەلی کەلبی ڕاسپارد کارێك بکات ئەم دوو کەسە لە ویلایەتی عەهد دوور بخاتەوە و بەستنی بەیعەت بۆ کوڕەکانی مەڕوان ڕێك بخات، عەمری کوڕی سەعیدی ئەشرەق دوا بەدوای جەنگیلەگەڵ موسعەبی کوڕی زوبێر و هەوڵدانی بۆ گێڕانەوەی ناتیلی کوڕی قەیسی حوزامی بەرەو (فەڵەستین) ئاشکرایکرد کە ئەو داوای ویلایەتی عەهد دەکات دوای مردنی مەڕوان،[١] ئەم داوایەی عەمر پاڵی بە مەڕوانەوە نا: بە هاوکاری حەسانی کوڕی مالیکی کوڕی بەجدەلی کەلبی بەیعەت بۆ عبدالملك و عبدالعزیزی کوڕی ببەستێ لە ٦٥کۆچیدا، مەڕوان حەسانی ئاگادارکردەوە، کە عەمر دەڵێ ئەو لە دوای مەڕوان دەسەڵات دەگرێتە دەست، حەسان گوتی: من عەمرت لێ دوور دەخەمەوە، ئینجا خەڵکی کۆکردەوە و وتاری بۆ دان و هەموو بەیعەتیان دا بە عبدالملك و عبدالعزیز و کەس نەیار نەبوو.[٢]

چەند مێژوونوسێك: (لەجێدانانی دوو کوڕەکەی لە دوای خۆی) بە گرنگترین کاری مەڕوان دادەنێن بەم کارەی حوکمڕانی لەنێو بنەماڵەی (مەڕوان)دا هێشتەوە و سنورێکی دانا بۆ کێبڕکێکردنی ئەندامانی بنەماڵەی ئومەوی لەسەر گرتنی جڵەوی حوکمڕانی، و کۆتایی بە هەموو ئەو کێشانە هێنا کە بە مردنی(خەلیفە) سەرهەڵدەدەن وەك ئەو کێشانەی بە مردنی (معاویەی دووەم) هاتنە پێشەوە.[٣]

تێبینی دەکرێت: مەڕوان هەندێك لە بڕیارەکانی کۆنگرەی (جابیە)ی هەڵوەشاندوونەوە کە پەیوەستن بە ئایندەی حوکمڕانی یەوە و پابەندی بەڵێنەکانی نەبووە، حەزی بە کورتهەڵاتنی جێنشینایەتی کردووە لە نێوان کوڕەکانیدا و گوێی بە بەڵێنشکێنی نەداوە و دەستی بە حەز و ئاواتەکانی خۆیەوە گرتووە، لەگەڵ ڕەچاو کردنی بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی خۆی و نەیارانی، کارێکی وای کردووە قایلبن و بەیعەت بدەن بە کوڕەکانی، لە هەمان کاتدا خالیدی کوڕی یەزیدی لەبەر چاوی خەڵکی شکاندووە و جنێوی سوکی پێداوە و، وێنەی ئەوی وا نیشانداوە کە

---

١ـ الدور السیاسي لأهل الیمن ص:٥٧.

٢ـ الانساب البلاذري(١٥٠/٥)، الدور السیاسي لأهل الیمن في الشام ص:٥٨.

٣ـ الدور السیاسي لأهل الیمن في الشام ص:٥٨.

بۆ جێنشینایەتی ناشێ، ئینجا لە سەرەتای ساڵی٦٥ك دا بەیعەت لە خەڵك وەردەگرێ بۆ عبدالملك و عبدالعزیزی کوڕی.[1]

مەڕوان بە زیرەکی و ئەزموونی بیری تیژی خۆی حوکمڕانی (ئومەوی) لە تەنگژە هێنایە دەر و خستیە نێو مەڵبەندی سەرکردایەتیکردن و بڕیاردان.

ئەمە ڕووداوێکی سادە و بێ شوێنەوار نەبوو، بەڵکو هەستاندنەوەیەکی نوێی حوکمڕانی ئومەوی بوو لە شام و میسڕ و لێخستنی سوفیانەکان و هاتنە سەرکاری مەڕوانیەکانی لە خۆگرتبوو، هیچ کۆسپ و لەمپەرێکی وا گەورە نەمان لە ڕێگەی عبدالملك دا تا بەسەر عبدالله ی کوڕی زوبێری خەلیفەی شەرعیدا زاڵبێ و پاشان دەستی بەتاڵ بێت بۆ چاکسازی ئیدارەی دەوڵەتەکەی، ئەو چاکسازیانەی ئەو ئەنجامیدان: ئەو بە نوێکردنەوەی ڕاستەقینەی دەوڵەتی ئومەوی و چەسپاندنی پایەکانی حوکومەتێکی خۆسەپێنی دەناسێنن، لەگەڵ ئەنجامدانی هەندێك کاری چاك و باش کە ناتوانرێت حاشایان لێبکرێت.

مەڕوانی کوڕی حەکەم لە٣/ڕەمەزانی/٦٥ك و لە تەمەنی٦٣ ساڵیدا مرد، (عبدالملك)ی کوڕی نوێژی لەسەر کرد، ماوەی (٩) مانگ و (١٨) ڕۆژ حوکمی گێڕا، لەنێوان دەرگای (جابیە) و دەرگای بچووك دا نێژرا.[2]

دوا قسەی (و جبت الجنة لمن خاف النار) بەهەشت بۆ کەسێکە لە ئاگر بترسێ بوو، مۆری ئەنگوستیلەکەی (العزة لله) بوو،[3] دەربارەی هۆکاری مردنی(٣) گێڕانەوەی جیاواز هەیە: یەکەمیان دەڵێ: بە تاعون مردووە،[4] دووەمیان دەڵێ: هاوسەرەکەی دایکی خالیدی کوڕی یەزید ژەهر خواردی کردووە، یان سەرینی لە سەردەمی داناوە تا خنکاوە،[5] سێیەم گێڕانەوە دەڵێ: بە شێوەی ئاسایی مردووە،[6] دژ بەیەکی گێڕانەوەکان بەڵگەن لەسەر ئەوە، کە ڕاستی هۆکاری مردنی

---

١- البداية و النهاية(١١/٧١٥).

٢- هەمان سەرچاوە (١١/٧١٤).

٣- هەمان سەرچاوە (١١/٧١٣).

٤ - مروج الذهب(٣/٨٩)، الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص:٥٩.

٥ - مروج الذهب(٣/٨٩)، الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص:٦٠.

٦- الطبقات(٥/٢٢٦).

نەزانراوە، بەڵام ئەو گێڕانەوەی هاوسەرەکەی بە کوشتنی تۆمەتبار دەکات بە چیرۆکێکی هەڵبەستراو دەچێت و لەلایەن خەڵکی نەیارەوە بۆ تانەو تەشەردان لە بنەماڵەی ئومەوی ڕەواجی پێدراوە، ئەم گێڕانەوە لەبەر ئەم هۆیانە ڕەت دەکرێتەوە:

١ـ وێنەی ئەم کردارە لەنێو ژنانی عەرەبدا نەبینراوە، وێڕای ئەوە ئەم ژنە خانمێکی ئازاد و شکۆدار بووە و بە خزمایەتی لە (عبدالشمس) دا بە شووەکەی دەگاتەوە.

٢ـ جێگە و پێگەی مەڕوان لەنێو بنەماڵەکەیدا و پلە و پایەی پۆستی جێنشینی ئەم تۆمەتە چاکتر ڕەت دەکاتەوە و بە دووری دادەنێ ڕووبەڕووی ئەم جۆرە کردارە بێتەوە.

٣ـ مردنی مەڕوان هیچ شوێنەوارێکی خراپی لە نێو بنەماڵەی ئومەوی بەجێ نەهێشت، بەتایبەت لە نێوان خالیدی کوڕی یەزید و عبدالملکی کوڕی مەڕوان، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی ئەم گێڕانەوەیە.

بەڵام ئەم گێڕانەوەی ئاماژە دەدا بە مردنی سروشتی و ئاسایی یان تووش بوونی بەتاعون، پێدەچێت وابێت، چونکە مەڕوان تەمەنی لە ٦٠ ساڵ تێپەڕیبوو،[1] لەگەڵ ئەمەدا لەم بەشی تەمەنی پیریەیدا زۆری هەوڵدا و ماندوو بوو، ئەمە پشتگیری ئەو ڕایە دەکەن کە بە ئاسایی مردبێ.[2]

---

١ ـ الاخبار الطوال ص:٢٨٦.

٢ ـ الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص:٦٠.

## باسی سێهەم: عبدالملکی کوڕی مـەڕوان و ململانێـی لەگـەڵ عبـدالله ی کوڕی زوبێر.

### یەکەم: ناو و بنەچەو ناسناو و کەمێك لە ژیانی.

**١ــ ناو و بنەچە و ناسناو:**

عبدالملکی کوڕی مەڕوانی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبیعاسی کوڕی ئومەییە، ئەبو وەلیدی ئومەوی، دایکی: عائیشەی کچی معاویەی کوڕی موغیرەی کوڕی ئەبوعاسی کوڕی ئومەییەیە.[1]

**٢ ــ لە دایکبوونی و ڕوخساری:**

عبدالملك وەك یەزیدی کوڕی معاویـە لـە سـاڵی ٢٦ك لـەدایکبووە، پـێش ئـەوەی دەسەڵات وەربگرێت لە ڕیزی خودا پەرستان و دنیا نەویستان و زانایان بوو، هاوڕێی هامۆشۆکەرانی مزگەوت و قورئانخوێنان بـوو، لـەو چوار کەسایەتیانە بـوو، کـە لـە کۆشکی دەسەڵات نزیـك بـوون، ددانـەکانی کیفـی زێڕیـان تێکرا بـوو، کەسـێکی زار ئاوەڵا بوو، بۆی هەبوو بێئاگا بێت و مێش بچێتە نێـو زاریـەوە، بۆیە پێـی دەگـوترا (أبو الذباب= خاوەنی مێش)، ڕەنگ سپی و چوارشـا بـوو، نـە لاواز بـوو نـە قەڵـەو، برۆکانی تێکەڵ بوون، چاوی شین و گەورە بوون، لـووتی باریـك بـوو، دەم و چـاوی درەوشـاوە بـوو، مـووی سەروریـشی سـپی بـوو و خەنـەی دەکـرد، گـوتراوە: دوای ئەوەی بۆتە حوکمڕان خەنەی کردووە.[2]

**٣ ــ خوێندن و بەندایەتی ئەو پێش حوکمڕانی و ستایشکرانی لە لایەن خەڵکەوە:**

نـافیع دەڵـێ: شـاری مەدینـەم بینیـوە، گـەنجێکی گـورج و گـۆڵتر و شـارەزاتر و

---

١ـ البداية و النهاية (٣٧٧/١١).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٣٧٩/١١).

قورئانخوێنێکی چاکترم لە عبدالملك ی کوڕی مەڕوانم تێدا نەبینیوە.[١]

ئەعمەش لە (ئەبی زەناد)ەوە دەگێڕێتەوە:

زانایانی مەدینە(٤) کەس بوون: سەعیدی کوڕی موسەییەب، عورِوە، قەبیسەی کوڕی زوئەیب، عبدالملك پێش گرتنی جڵەوی دەسەلات.[٢]

ئیبن عومەر دەڵێ: خەلك ڕۆڵەیان دەبێ، بەلام (مەڕوان) باوکی لێبووە واتە: عبدالملك،[٣] مەبەستی ئیبن عومەر ئەوەیە: عبدالملك تەمەنی بەرەو سەر چوو بوو و بەسەر هاوتەمەنانیدا بەرز ببۆوە.[٤]

یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: یەکەمین کەس نوێژەکەی لە نیوەڕۆوە تا عەسر درێژەی کێشا عبدالملك و چەند لاوێکی هاوڕێی بوون، سەعیدی کوڕی موسەییەب گوتی: بەندایەتی بە زۆری نوێژ و ڕۆژوو نییە، بەڵکو بریتییە لە بیرکردنەوە لە گەورەیی خودا و خۆپارێزی یە لە قەدەغەکراوەکان،[٥] ڕاست دەکاﷺ.

شەعبی دەڵێ: لەگەڵ هەرکەسێك دانیشتبم زیاترم بەسەرەوە هەبووە، جگە لە عبدالملك ی کوڕی مەڕوان، ئەگەر قسەیەکم بۆ گێڕابێتەوە زیاتری بۆ گێڕاومەوە، ئەگەر هۆنراوەیەکم بۆ خوێندبێتەوە زیاتری بۆ خوێندوومەوە.[٦]

**٤ ـ بە گەورە دانانی ناوی (اللە):**

بەیهەقی دەگێڕێتەوە: عبدالملك فلوسێکی لێدەکەوێتە ناو بیرێکی پیسەوە، یەکێکی بە (١٣) دینار بە کرێ گرت تا بۆی بێنێتە دەرەوە، سەبارەت بەمە پێی گوترا، گوتی: ئەو فلوسە ناوی (اللە)ی لەسەر نوسرا بوو.[٧]

---

١ ـ البداية و النهاية(١١/٣٧٩).
٢ ـ هەمان سەرچاوە (٣٧٩).
٣ ـ هەمان سەرچاوە.
٤ ـ الخلافة الاموية للهاشمي ص:١١٦.
٥ ـ البداية و النهاية(١١/٣٨٠).
٦ ـ هەمان سەرچاوە.
٧ ـ هەمان سەرچاوە.

**٥ ـــ زیکری خودا لە سەفەردا:**

ابن ابي الدنيا دەڵێ: کە عبدالملك لە ڕێگادا چاوی بە درەختێك دەکەوت بە هاوڕێکەی دەگوت: (سبحان الله)مان پێ بکە تا دەگەینە ئەو درەختە، (الله أكبر)مان پێ بکە تا دەگەینە هۆ و بەردە و هەروەها.[١]

**٦ ـــ ئایا ڕاستە دەڵێن پشتی لە قورئان کردووە؟**

گوتراوە: کاتێك قورئانی لەنێو کۆشیدا داناوە گوتویەتی: ئەمە دوایین جار بێت،[٢](إبن كثير) ئەم ڕیوایەتەی بە (ضعيف) واتە بە لاواز و بێ هێز داناوە و بە دەربڕینی کز (قيل- گوتراوە) گێڕاوەتیەوە.[٣]

عبدالملك بە مامۆستای منداڵەکانی خۆی ئیسماعیلی کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی أبى المهاجرى گوتووە، چۆن فێری قورئانیان دەکەی ئاواش فێری ڕاسگۆیی یان بکە.[٤]

**٧ ـــ چ شتێك ئەم گەنجەی ڕەوشت داداوە و پیاوەتی ئەوی جوانکردووە؟**

ئین سعد بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە بە بەڵگە بۆ عبدالملك، کە مرۆڤێکی خۆشەویست و لەبەر دڵ بووە بەتایبەتی لەلای مامەکانی واتە: پیاوە گەورەکانی بەنی ئومەییە، ڕۆژێك معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان و عەمری کوڕی عاص ﷺ دانیشتبوون، عبدالملك بە لایاندا تێدەپەڕی، معاویە دەڵێ: دەبێ چ شتێك ئەم گەنجەی ئەدەب دادابێ و مەردێکی ئاوا جوانی لێ دروستکردبێ؟ عەمر دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئەم گەنجە(٤) سیفەتی ڕەچاوکردوون و(٣) سیفەتیشی واز لێهێناون: کاتێك دەکەوێتە قسە جوانترین وشە بەکاردێنێ، کاتێك قسەی بۆ دەکرێ بە باشی گوێ شل دەکات، کاتێك دەگات بە کەسێك بە جوانترین زەردەخەنە

---

١ـ البداية و النهاية(١١/٣٨٠).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەرگیز قسەیەك ناكات پەشیمانی بە دوادابێ، لەگەڵ خەڵكانی پەرست و بێ ڕێز تێكەڵ نابێت، گاڵتە و گەپ لەگەڵ كەسێك ناكات متمانەی لەسەر ئاوەز و پیاوەتی ئەو نەبێت.[١]

### ٨ ــ وەسێتی بۆ مامۆستای ڕۆڵەكانی:

عبدالملك بە مامۆستای منداڵەكانی ئیسماعیلی كوڕی عوبەیدوڵلای كوڕی أبی المهاجری گوت: چۆن فێری قورئانخوێندیان دەكەیت ئاواش فێری ڕاسگۆیی یان بكە، لە خەڵكی سوك و پەستیان دوربخەرەوە: چونكە ئەوانە خراپەی نێو خەڵكی و ڕووهەڵماڵاو و مشەخۆرن،[٢] سیفەتی تورەبوونیان لێ داماڵە چونكە تورەبوون ڕەوشتە جوانەكان تێكدەدا، سەریان بۆ بتاشە ملیان ئەستور دەبێ، فەرمانیان پێ بكە سیواك بكەن و ددان و لا شەویلگە و زمانیان پاك ڕابگرن، كە ئاویان خواردەوە با هەڵی بملیسن و هەڵی نەقورتێنن، كاتێك ئەدەبیان دادەدەی یان فێری ڕەوشتێكیان دەكەی، بەنهێنی ئەم كارە بكە، با لەبەر چاوی خەڵك كەم و سوك نەبن.[٣]

### ٩ ــ هەڵوێستی عبدالملك لە بەرامبەر (ئیبن زوبێر) پێش و پاش جڵەوی حوكم:

ئەو دوو هەڵوێستی دژ بە یەكی هەبوون لە بەرامبەر ئیبن زوبێردا:

یەكەم: پێش حوكمگێڕان: پەنای بە خوا دەگرت خەلیفە سوپا بەرەو (مكە) بەڕێ بكات و پەلاماری ئیبن زوبێر و هاوەڵانی بدات، پێی وابوو كاری لەم جۆرە تاوانێكی گەورەیە.[٤]

یەحیای غەسانی دەڵێ: كاتێك موسلیمی كوڕی عوقبە چووە (مەدینە)، چوومە نێو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)، لە تەنیشت عبدالملك دانیشتم، عبدالملك پێی

---

١ـ الطبقات لابن سعد.

٢ـ هەمان سەرچاوە (١١/٣٨٩).

٣ ـ هەمان سەرچاوە (١١/٣٨٩).

٤ ـ الخليفة الاموي للهاشمي ص:١١٦.

گوتم: تۆ لەگەڵ ئەم سوپایەی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: دەك دایكت سنگت بۆ بكوتێ! ! دەزانی بۆ لای كێ دەڕۆی؟ بۆ لای یەكەمین لە دایكبووی ئیسلامی دوای هیجرەت، بۆ لای كوڕی دڵسۆزی پێغەمبەری خوداﷺ، بۆ لای كوڕی (ذات النطاقین خاوەن دوو پشتێن)، بۆ لای كەسێك پێغەمبەری خودا خورمای جوراوی دەمی پیرۆزی خستۆتە بن مەلاشوی دەچی؟ سوێند بە خوا ئەگەر بە ڕۆژ بچیتە لای دەبینی بە ڕۆژوە، ئەگەر شەو بچیتە لای دەبینی لە نوێژدایە، ئەگەر خەڵكی سەر زەوی گەلەكۆمەی كوشتنی لەسەر بكەن، خودا هەموویان بەسەر ڕووانیاندا دەباتە دۆزەخ.[١]

هەڵوێستی دووەم: دوای حوكم گێڕان: بە تەواوی پێچەوانەی هەڵوێستی پێشەوایەتی، عبدالملك بەسەركردایەتی (حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفی) سازوباز دەكات و بەرەو (مكە)ی بەڕێدەكات، كاتێك ئیبن زوبێر لە پەنایكەعبە خۆ پەنا دەدا سوپاكە گەمارۆی دا تا ئەوكاتەی كوشتیان.[٢]

## دووەم: ژیانی سیاسیانەی پێش حوكمگێڕان.

لەكارەساتی كوژرانی عوسمانی كوڕی عەفان دا تەمەنی (١٠) ساڵ بوو، ئەم كارەساتە یەكەمین ڕوداوی واقیعی بوو كە كاریگەری خۆی لەسەر عبدالملك بەجێ هێشتبوو، ئەم كاریگەریە لەكاتی گرتنی جڵەوی دەسەلاتیدا دەركەوت،[٣] لە وتارێكیدا دەڵێ: بەلای ئێمەوە هەموو شتێك لە لایەن ئێوەوە كە دەیكەن قابیلی قبوڵە جگە لە هەڵكردنی ئاڵا و خۆ كوتان بۆ سەر مینبەر لە سەردەمی معاویەی كوڕی ئەبوسوفیان دا یەكەم پۆستی ئیداری وەرگرتووە و بۆتە كاربەدەستی (حەجەر)،[٤] دوای وەفاتی (زەیدی كوڕی سابیت)یش بۆتە سەرپەرشتیكاری دیوانی شاری مەدینە.[٥]

---

١ـ تأريخ الخلفاء للسيوطي ص:٢١٧.
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص: ٦٤.
٤ ـ المعارف لابن قتيبة ص:٣٥٥، الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص:٦٤.
٥ـ الطبقات (١/٢٢٥).

لە جیهاد دا بەشداری کردووە و ساڵی ٤٢ك لە پێشەوەی هەڵمەتێکدا بەرەو (ڕۆم) چووە،[١] دەڵێن: لەگەڵ معاویەی کوڕی حەدیج دا ئەفریقیای گرتووە و معاویە گرتنی (جەلەولا)ی خستۆتە ئەستۆ لە وڵاتی ئەفریقیا.

ئەو لە سەردەمی (یەزید)دا دەربارەی (ئیبن زوبێر) دەیگوت: ئیمڕۆ کەسێك لەسەر زەوی دا لە ئیبن زوبێر باشتر نیە،[٢] هەروەك پەیوەندی لە موسعەبی کوڕی زوبێر پەیوەندی دۆستانە بوو.

بەڵام دەربارەی ڕۆڵی سیاسی عبدالملك لە سەردەمی مەڕوانی کوڕی حەکەم دا: سەرپەرشتی ئیدارەی فەلەستینی کردووە و ڕوحی کوڕی زنباع لە جێگەیدا کارەکانی بەڕێوەدەبردن.[٣] دەکرێ ئەمە بکرێتە پاساوێك تا لە دیمەشق لای باوکی بێت و لە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتدا یاریدەی بکات، سەردەمی ئەو کاتی مەڕوان سەردەمی دوژمن و نەیاری زۆری دەرەوە و نێوخۆ بوو، کە باوکی بەرەو میسر بەڕێکەوت ئەو سەرپەرشتی ئیدارەی دیمەشقی دەکرد.[٤] ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر وریایی و توانای تەواوی عبدالملك لە بەڕێوەبردندا.[٥]

## سێهەم: ئەو زانایانەی لەگەڵ عبدالملك بوون.

ژمارەیەك لە زانایانی شام بەیعەتیان بە عبدالملك دا، بەڵام لە چاو ئەو زانیانەی بەیعەتیان بە (ئیبن زوبێر) دا. یان ئەو زانایانەی بەیعەتیان پێ نەدا ژمارەیان زۆر کەم بوو و بایی ئەوەندە نەدەبوون ڕای ئوممەتیان لەسەر پێك بێت بۆ کرانی بە (خەلیفە)، ئەمە لە لایەك کە تەنها زانایانی شام بوون بەیعەتیان پێدا، وێنەی ئەو زانایانە: زانای گەورە قەبیزەی کوڕی زوئەیب رحمه الله،[٦] یەزیدی کوڕی ئەسوەدی جەرشی رحمه الله هاوڕێی عبدالملك دەبێ لە هێرشەکەی سەر موسعەبی کوڕی

---

١- تاريخ خليفة(١/٦٩).

٢- الطبقات(٥/٢٢٦).

٣ - أنساب الاشراف(٥/١٢٧).

٤ - الكامل في التاريخ، نقلاً عن الدور السياسي لأهل اليمن ص:٦٥.

٥ - الدور السياسي لأهل اليمن ص:٦٥.

٦ - أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الاموية ص:٥٤٢.

زوبێر، دەڵێن: کاتێك ئاپۆڕای هەردوك سوپای بینین گوتی: خودایە نێوانێك بۆ ئەم دوو شاخە بکە و بە یەك هەڵنەشاخێن، خودایە کامیان بە لاتەوە خۆشەویستە کاروباری بخەرە بەردەست.[١]

## چوارەم: بزوتنەوەی (توابین) و جەنگی (عین الوردة) لە ٦٥ کۆچیدا.

دوا بەدوای مردنی یەزید و هەڵاتنی عبدالله ی کوڕی زیاد ئاڵۆزی تەواوی عێراقی گرتەوە، بە پەلە و بێ دواکەوتن پشتیوانانی حوسێن بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی حوسێن پەیوەندیان بە یەکترەوە کردەوە، چونکە پاش کارەساتەکە گیانی تۆڵە هەژاندنی و لە پشتیوانی نەکردنی پەشیمان بوونەوە، بۆیە بۆ سڕینەوەی تاوانی سەرنەخستنی حوسێن هیچ هۆکارێکی باشتر لە تۆڵە سەندنەوەی خوێنی حوسێن یان دەست نەکەوت تا ڕووی خۆیانی لە لای خودا و خەڵك پێ سپی بکەنەوە.[٢]

شیعە بە سەرۆکایەتی (صردی خوزاعی) زوو زوو کۆدەبونەوە و هەڵوێست و شێوازی کاری خۆیانیان دەخستە بەرباس و لێکۆڵینەوە، کۆبوونەوەکان بابەتی تۆبە و لێخۆشبوونی خودایان بەسەردا زاڵببوو، ئینجا دەستیان بە ڕێکخستنی هێزی سەربازی کرد.

(توابون) لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ٦٥ك دا و لە ڕۆژی دیاریکراوی دەرچونیان و لە (نحیلة) ڕا بەڕێکەوتن، وێستگەی یەکەمی تۆڵە سەندنەوەیان (کەربەلا) بوو، کاتێك گەیشتنە گۆڕی حوسێن کوڵیان هەستا و گریان و تۆبەیان کرد، ماوەی شەو و ڕۆژێك گریان و کەوتنە حاڵەتی جەزبەوە و بڕیاریاندا بەرەو شام بەڕێبکەون و پەلاماری عبیدالله ی کوڕی زیاد بدەن، بەو پێودانەی ئەو فەرمانی کوشتنی حوسێنی دەرکردووە، بە حیسابی خۆیان چاکترین ڕێگەچارەیان هەڵبژارد بۆ تۆڵە سەندنەوە،[٣] سوپای (توابین) بە شاری (هیت)ی نزیك (فوڕات)دا تێپەڕی، پاشان بە

---

١ـ سیر أعلام النبلاء(٤/١٣٧).
٢ـ الكامل في التاريخ(٢/٦٣٥).
٣ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن تأريخ الدولة الاموية، طقوش ص:٧١.

قەراغی ڕووباردا بەرەو سەر ڕۆیشت تا گەیشتە (قرقیسیا)،[١] ئەم شارە کۆتا سنووری دەسەلاتی ئیبن زوبێر بوو لە عێراق،[٢]زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی ی ئەمیری (قرقیسیا) بە گەرمی پێشوازی لێکردن، هەردولا بەرژەوەندی هاوبەش واتە: دژایەتی ئومەویەکان کۆی کردبوونەوە، (زوفەر) پێشنیاری یەکگرتنی ڕیزەکانی (توابین)ی لەگەڵ سوپای (ئیبن زوبێر) خستە ڕوو، بەلام ئەوان ئەم پێشنیارەیان قبوڵ نەکرد و داوای لێبوردنیان کرد، (زوفەر) داوای لێکردن لەم بڕیارە (خۆکوژیە)یان پاشگەز ببنەوە، بەلام ئەمەشیان ڕەتکردەوە، توێشوو و پێداویستیان پێچاپەوە و بەرەو شوێنی مەبەست بەڕێکەوتن.[٣]

(توابون) لەگەڵ سوپای ئومەوی لە (عین الوردە)ی خاکی (جزیرە)ی باکوری ڕۆژئاوای (صفین) و لە ساڵی ٦٥ك دا پێکهەڵشاخان، ئومەویەکان جەنگێکی نا بەرمبەریان لەگەڵ کردن، سوپایەکی زۆری ئەوان گەمارۆی دان و دەرەنجام سەرۆکەکەیان لێ کوشتن و هەموویان لەنێو بردن، جگە لە ڕوفاعەی کوڕی شەداد، کە بە ژمارەیەکی کەمەوە بەرەو (کوفە) گەڕایەوە.[٤]

ذهبي دەربارەی سلێمان کوڕی صردی سەرۆکی (توابین) دەڵێ: ئەو پیاوێکی بە دین و خودا پەرست بوو، لەگەڵ سوپایەك دەرچووبوو، کە تۆبەیان لە تاوانی سەرنەخستنی حوسێنکردبوو، بۆ سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی حوسێن دەرچوون، بۆیە ناویان لێنرا (سوپای توابین).[٥]

إبن كثیر دەڵێ: ئەگەر ئەم بڕیاردان و کۆبوونەوەیان لە پێش گەیشتنی حوسێن بایە بۆ شوێنی تێدا شەهید بوونی، زۆر بەسوود تر دەبوو و سەرکەوتنی حوسێنی تێدا دەبوو، بەلام گیانفیدایەیان لە کاتێکدا بوو کە (٤) ساڵی تەواو بەسەر شەهید بوونی حوسێن دا ڕابردووە.[٦]

---

١ـ الكامل في التاريخ(٢/٦٣٨).
٢ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن تأريخ الدولة الاموية، طقوش ص:٧١.
٣ـ تأريخ الدولة الاموية، طقوش ص:٧٢، الكامل في التاريخ(٢/٦٣٩).
٤ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن تأريخ الدولة الاموية،ص:٧٢.
٥ـ سير أعلام النبلاء(٣/٣٦٥).
٦ـ البداية و النهاية(١١/٦٩٧).

تەمەنی سلێمانی کوڕی صردﷺلە ڕۆژی کوژرانی دا گەیشتبووە (٩٣) ساڵ.[1]

بەڕاستی کە مرۆڤ لە هەڵوێستی ئازایانە و بوێرانەی (توابین) ڕادەمێنێ هەناسەی سواردەبێ، ژمارەیان لە(٤) هەزار کەس تێنەپەڕیبوو، بە باوەڕێکی پتەو و ئازایەتیەکی بێ ئەنداز و دان بەخۆداگرتنێکی تێر و تەواوەوە چوونە نێو گۆڕەپانی جەنگەوە و بە لانی کەم بەرەو ڕووی (٢٠) هەزار جەنگاوەری شامی بوونەوە و زیانێکی گەورەی گیانیان لێ دان و کوشتارێکی زۆریان لێکردن تا کار بەوە گەیشت دەستیان لە خوێندا شەلاڵ بوو، ئەگەر زۆری سوپای شام نەبوایە و گەمارۆیان نەدابان و ڕێگاکانیان لێنەگرتبان و تیربارانیان نەکردبان بەڵێ ئەگەر دەرفەتێکیان بەدەستەوە مابایە هەرگیز بە سەریاندا سەر نەدەکەوتن.[2]

کە مرۆڤ بەرامبەر ئەم ئازایەتی و دڵسۆزیی و خۆتواندنەوەیان سەرسام دەبێ هیچی بە دەست نامێنێ جگە لە پرسیارێك: ئەم پاڵەوانانە لەکوێ بوون کاتێك حوسێن و کەس و کاری بەرەو ڕووی مەرگ ببونەوە لە کەربەلا، ئازایەتی و دڵسۆزیەکەیان لە کوێ بوو کە پەیمانیان دەشکاند و بە هاوار حوسێنەوە نە دەچوون؟!.[3]

## گرنگترین هۆی تێکشکانی( توابین ):

١ ـ کەمی ژمارەیان لە بەرامبەر ژمارەی سوپای شام، ژمارەی سوپای شام زیاتر لە (٢٠)هەزار جەنگاوەر بوو، جگە لەو ژمارە سەربازانەی عبیدالله ی کوڕی زیاد بۆ ئیحتیات مابونەوە و چاوەڕوان بوون.

٢ ـــ لاوازی (توابین) لە بواری تاکتیکی سەربازیدا، هیچ کام لە سەرکردەکانی(توابین) بەرامبەر نەدەکرا بەعبیدالله ی کوڕی زیادیان حصینی کوڕی ئەمیر لە بواری شارەزایی و توانای سەربازیدا، ئەم بیروڕایە لەگەڵ وەسفی

---

١ـ هەمان سەرچاوە (١١/٧٠٣).
٢ـ الامويون، للوكيل(١/٣١٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە.

موختاری سەقەفی بۆ سولێمانی کوڕی صرد یەکدەگرێتەوە، کە دەیگوت: سلێمان پیاوێکە شارەزای مەیدانی جەنگ و سیاسەت نیە.[1]

٣ ـ بێتوانایی بەشدار پێکردن: کاتێك إبن صرد ژمارەی بەیعەتدەرانی (بصرە و مدائن)ە ژمارد (١٦) هەزار کەس بوون، چونکە ئەم خەڵکە ڕێکنەخرا بوو، بەس (٤) هەزار کەس بۆ جەنگ ئامادەکرا.

٤ ـ بەشدارینەکردنی موختاری سەقەفی لەم جەنگەدا، جگە لەمەش خەڵکی لە سلێمان سارد دەکردەوە.[2]

## پێنجەم: بزووتنەوەی موختاری ئەبی عوبێدی سەقەفی:

ناوی: موختاری کوڕی ئەبی عوبێدی سەقەفی درۆزنە ، ناوی بابی: ئەمیر ئەبو عوبێدی کوڕی عەمری کوڕی عومەیری کوڕی عەوفی کوڕی عوقدەی سەقەفییە، پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیاندا بووە کە موسڵمان بووە، نەزانراوە کە هاوەڵایەتی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردبێ، عومەر ﷺ کردوویەتی بە سەرکردەی سوپایەك لە فەتحی عێراقدا، ڕووداوی (جیسری ئەبی عوبێد) خراوەتە پاڵ ئەو. موختار گەورە بوو پێگەیی، بوو بەیەکێك لە گەورەکانی سەقیف، خاوەنی ڕا و ڕەوانبێژی و ئازایەتی و دانایی بوو، بەڵام کەمدینبوو.[3] پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (یکون في ثقیف کذاب و مبیر)،[4] موختار درۆزنەکەیە، پڕوپاگەندەی دەکرد کە وەحی بۆ دێ و لە غەیب دەزانێ، کەواتە(کذّاب) ڕێك موختارە، (مبیر)یش بە واتای لەنێوبەر دێ و بەسەر (حجاج)دا دەچەسپێت، قیحهما الله تعالی خوا ڕوویان ڕەش بکات.[5]

موختار دوای مردنی یەزیدی کوڕی معاویە لەساڵی ٦٤ك هاتە سەر شانۆی ڕووداوەکان، ئەویش لە ڕیزی ئەو کەسە نەیارانە بوو سەردەمی ئومەوی ژانی پێوە

---

١ـ أنساب الاشراف(٥/٢٠٧).
٢ـ سیر أعلام النبلاء(٣/٥٤٠)، عبدالله بن الزبیر، للناطور ص:١٤٨.
٣ـ سیر أعلام النبلاء(٣/٥٣٩).
٤ـ مسلم رقم:٢٥٤٥.
٥ـ سیر أعلام النبلاء.

گرتبوون و هێنانیە ئاراوە، هەرچەند دڵ و دەروونی پڕبوو لە ڕق و کینە بەرامبەر بە ئالوبەیت. بەڵام دووڕوو ئاسا خۆی لێ کردبوونە دڵسۆز و پروپاگەندەی دەکرد کە خۆشی دەوێن و داوای تۆڵەی حوسێنی دەکردەوە.[١] لە کتێبی (عن الحسن بن علي بن أبي طالب) دا گێڕاومەتەوە: کە ئەو فەرمانی بە سەعدی کوڕی مەسعودی سەقەفی مامی کردووە حەسەنی کوڕی عەلی بگرێت و بە خەڵات بیداتە (معاویە) تا لای ئەو پشکێکی باشی دەستکەوێ.[٢]

ئینجا هەوڵی دا پەیوەندی بە (عبداللە ی کوڕی زوبێر)ەوە بکات و لەگەڵی پێکبێ، بۆ ئەو مەبەستە چەند مەرجێکی بەسەر عبدالله دا دان: لەو مەرجانە:

- دەبێ ئەو یەکەم کەس بێت بچێتە ژوورەوە بۆ لای.
- نابێت (ئیبن زوبێر) هیچ بڕیارێك بەبێ ئەو ببڕێنێتەوە و هیچ کارێك بەبێ ئەو ڕاپەڕێنێ.
- هەر کاتێك سەرکەوتنی بەدەستهێنا، دەبێ لە کاروبارە گەورە و گرنگەکاندا پشتی پێ ببەستێ.[٣]

بەکورتی: دەیەویست لە دەوڵەتەکەی (ئیبن زوبێر)دا قسەی هەبێت، بەڵام هیچ وەڵامێکی لەلایەن (ئیبن زوبێر) دەست نەکەوت، ناچار بەرەو (کوفە) ڕۆیشت و لەوێ گیرسایەوە.[٤]

بارودۆخی (کوفە) ئاڵۆز بوو، ویستی لە ئاوی لێڵدا ڕاو بکات، کاغەزی تۆڵەی حوسێنی هەڵدایە سەر مێزی قومار، بە درۆی خۆی گوتی: ئەم ئەرکەی لەلایەن محمدی کوڕی علی ناسراو بە محمدی کوڕی حەنیفە پێ سپێردراوە، بڕیاریدا سواری شەپۆلی لافاوی شیعە بێت و دەرەنجام بگاتە کەناری حوکم و دەسەڵات.

ئەو لە دوا ساتەکانی ژیانیدا ئەم نیازە بەدەی لای دڵسۆز و نزیکەکانی خۆی دەربڕیوە، ئەوان باوەڕیان وابوو: موختار ڕاست دەکات و تۆڵە (ئالوبەیت)

---

١ ـ البداية و النهاية(١١/٦٦).
٢ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص:٤٨٢.
٣ـ الكامل في التأريخ، نقلاً عن العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص:٤٨٢.
٤ـ البداية و النهاية(١١/٦٦).

دەکاتەوە، موختار لەکاتی گیاندەرچونیدا و تەنگ پێ هەڵچرانیدا و لەنێو جەرگەی مەیدانی جەنگ بانگی سائیبی کوڕی مالیکی ئەشعەری دەکات و پێی دەڵێ: ڕات چییە؟ سائیب دەڵێ: ڕاهی خۆتە، دەڵێ: من ڕام وایە یان خودا؟ دەڵێ: ڕای خودایە، دەڵێ: وای بۆ تۆ: چەندە گێل و کەودەنی! من تەنها پیاوێکم لە پیاوانی عەرەب، تەماشام کرد: (ئیبوزوبێر) دەستی بەسەر (حیجاز)دا گرتووە، (نەجدە)ش بەسەر یەمامەدا، مەڕوانیش بەسەر (شامدا)، منیش تەها وەك ئەوانەم و زیاتر نا، بۆیە دەستم بەسەر ئەم وڵاتەدا گرت، من وەك یەكێك لەئەوان بووم بەڵام من زێدەڕۆییم کرد، تا بەم ڕۆژە تاڵە گەیشتم، ئێستا ئەگەر هیچ نیازێکت نیە بڕۆ بۆ خۆت و ڕزگاری خۆت شەڕ بکە، سائیب گوتی: (إنا لله و إنا إليه راجعون).[1]

سائیب بۆیە ئەمەی گوت: چونکە ئەو کاتە بۆی دەرکەوت موختار هەر کارێکی کردووە تەنها لە پێناوی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا بووە و بە تەنها، هەر بۆیە (ذهبي) وەسفی درۆزنی و بێ دینی دەداتە پاڵ موختاری سەقەفی.[2]

لە کاتێکدا سلێمانی کوڕی سەردی خوزاعی ی سەرۆکی (تەووابین) خەریکی ئامادەکردنی سوپا بوو بۆ سەر (شام) و عبیداللە ی کوڕی زیاد و سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی حوسێن، موختار لەو کاتەدا خۆی زەق کردبۆوە و هەوڵیدا خەڵك لە سلێمان بتەکێنێتەوە، پڕوپاگەندەکەی سەری گرت و (٢)هەزار شیعەی پاشگەز کردەوە و لە دەورەی خۆی هاڵاندن، دەرەنجامی جەنگی (عين الوردة) بە قازانجی موختار تەواو بوو، بۆچوون و پێشبینییەکانی دەربارەی دەرەنجامی شەڕەکە بە ڕاست دانران، بەتەنیا خۆی مایەوە بۆ سەرکردایەتیکردنی شیعە، ڕزگاربووانی ئەو جەنگە پەنایان بۆ ئەو هێنا، بزوتنەوەکەی بەهێز بوو، شوێنکەوتوانی زۆر بوون، ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەری نەخەعی، کە یەك لە سەرانی کوفە بوو هاتە نێو بزووتنەکەیەوە، بەمە بەهێزترو سەقامگیرتر بوو، کودەتای بەسەر عبداللە ی کوڕی موتیعی عەدەوی ئەمیری کوفەی سەر بە (ئیبن زوبێر) کرد و دەستی بەسەر کوفەدا گرت.

---

١ـ تأريخ الطبري(٦/٦٧٧).
٢ـ سير أعلام النبلاء(٣/٥٣٩).

# موختار و قەڵاچۆکردنی بکوژانی حوسێن

بەمەبەستی سەلماندنی پڕوپاگەندەی سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی حوسێن و ڕاستی داواکەی، ڕاوەدوی بکوژانی حوسێنی داو زۆربەیانی لە کوفەدا کوشتنەوە،[1] ئینجا لەساڵی٦٧ك دە سوپایەکی بە سەرکردایەتی ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر ڕێکخستن و بەرەو ڕووی عبیدالله ی کوڕی زیادی پێکردەوە، لەلای ڕووباری (خازەر)ی نزیك (موسڵ) پێك گەیشتن، دەرەنجام سوپاکەی (ئیبن زیاد) شکستی خوارد و(ئیبن زیاد)یش لە گۆڕەپانی جەنگدا کوژرا و ڕەپ هەڵاتن.[2]

کاتێك (ئیبن زیاد) کوژرا (ئیبن موفەڕڕەغ) گوتی:

| | |
|---|---|
| إن المنايا إذا ما زُرن طاغية | هتكن أستار حُجّاب و أبواب |
| أقول بُعداً و سُحقاً عند | لابن الخبيثة و ابن الكودن الكابي |
| لا أنت زُوحِمت عن ملك فتمنعه | و لا مُتّ إلى قوم بأسباب.[3] |

موختار سەرەتا دەستی بە گرتن و کوشتنی ئەو کەسانە کرد کە لەگەڵ ئیبن زیاد بەشداری کوشتارگەی کەربەلایان کردبوو، ژمارەیەکی زۆری لە سەرەزلەکان کوشتەوە، وەك: عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسی ئەمیری سوپای کەربەلا، شمەری کوڕی ذیجۆشەنی ئەمیری ئەو هەزار کەسەی سەرپەرشتی شەهیدکردنی حوسێنیان کرد، سەنانی کوڕی ئەبی ئەنەس و خەولی کوڕی یەزیدی ئەسبوحی و هی تریش.[4]

ڕۆژی عاشورای ساڵی٦٧ی کۆچی ڕۆژی کوژرانی عبیدالله ی کوڕی زیاد بوو، ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر سەلکە سەری عوبەیدوڵڵای بۆ موختار نارد،[5] موختار پاش

---

١ـ العراق في العصر الاموي، ثابت الراوي ص:٢٥٠،٢٥١.
٢ـ الكامل في التأريخ(٢/٧).
٣ـ الكامل في التأريخ(٢/٩).
٤ ـ البداية و النهاية(١١/٦٦).
٥ ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص:٤٨٤.

ئەم سەرکەوتنەی بازنەی دەسەڵاتی فراوانبوو، باکوری عێراق و خاکی (جزیرە)ی زەوت کرد، کاربەستانی خۆی لە هەرێمەکاندا بڵاوکردەوە،[١] باج و خەراجی لەو هەرێمانەوە بۆ دەهات، زۆر لە خەڵکانی نا عەرەب پەیوەندیان پێوەکرد، چونکە زۆریان ڕق لە (بني أمية) دەبۆوە[٢] لەلایەکو، لەلایەکی ترەوە موختار سامانێکی زۆری خستبووە بەردەمیان،[٣] بەم شێوەیە دەرکەوت موختار دەوڵەتێکی تایبەت بە خۆی لە عێراقدا دامەزراند، لە نێوان دەوڵەتەکەی عبدالملك لەشام و دەوڵەتەکەی ئیبن زوبێر لە حیجاز.[٤]

**١ــ هۆیەکانی سەرکەوتنی بزوتنەوەی موختار لە قۆناغی یەکەمیدا:**

بزوتنەوەی موختار لە سەرەتادا سەرکەوت: لەبەر ئەم چەند هۆکارە:

أــ زەمینەی لەبار:

لەکاتێکدا بزوتنەوەی (توابین) لە ڕێی هەڵمەتە شەهادەتخوازیەکەی گەیشتە ئەو ئەنجامەی خۆی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، پەژارە و پەرۆشیەکەی لە (کوفە)دا دەنگی دایەوە، دڵ و دەروونی خەڵك پڕ ببوو لە داخ و ڕق و تۆڵە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە (ئیبن زوبێر) پشگیری قەوارەی دەسەڵاتی خۆی نەدەکرد لە (کوفە)دا، نە سوپای دەنارد، نە بە پارە و سامان سەرۆکهۆزەکانی بۆ لای خۆی ڕادەکێشان، بە بۆچوونی ئەو،دەبێ مەیدانی جەنگ و هەرا لە(کوفە)دا بۆ شوێنکەوتوانی موختار و ئومەویەکان چۆڵ بکات و ئەم دوو لایەنە لە نێو کۆلە ئاشتی جەنگدا بهاڕدرێن و دوایەش ئەو سود و قازانجی گەورەی بەربکەوێت.[٥]

ب ــ دەربڕینی هەستی سۆز و خۆشەویستی بۆ (بەنی هاشم) لەلایەن موختارەوە، دیاری و بەخششی گرانبەهای بۆ دەناردن و بەردەوام کاری دەکرد بۆ

---

١ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص:٤٨٤.
٢ـ الدولة الاموية في الشرق، للنجار ص:١٤٣.
٣ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي ص:٤٨٤.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ ـ من دولة عمر إلى دولة عبدالملك ص:٢٠٤،٢٠٥.

ڕاکێشانیان.[١]

ج ـ ڕەنگدانەوەی کەسایەتیەکی بەرچاو لە سەرکردایەتیەکەی موختاردا: لە کاتی نەبوونی سەرکردایەتیەکی سیاسی ناوەندی لە (کوفە)دا تا بتوانێ ئاراستەکانی (شیعە) یەکخات و شتە سەرهەڵداوە نوێکان قبوڵ بکات، هەموو ئەو فێڵ و زرنگی و نەرمونیانی توانایەی موختار ناکرێ فەرامۆش بکرێت، ئەو بەو سیفەتە کاریگەرانەیەوە توانی سود لە کارەساتی کوژرانی حوسێن و حجری کوڕی عدي و (توابین) وەر بگرێت و بە باری بەرژەوەندی خۆیدا بەکاریان بێنێ، وێڕای ئەمە موختار خاوەن کەسایەتیەکی دەرکەوتووی مەیدانی سیاسەت بوو و لە گەمەکانی ئەم بوارە شارەزا بوو.[٢]

د ـ ئەو نەخشە زانستیەی پێی چۆ پێشەوە: نەتەوەکانی تر واتە: نا عەرەبەکان پێکهاتەیەکی گەورەی ناو کۆمەڵگا بوون، بەڵام بەشمەینەت و چەوساوە بوون، ئەوان لە بزوتنەوەکەی موختاردا دەرفەتی هەناسەدانیان دەستکەوت، بۆ ڕزگاری و ئازادی و یەکسانی و چاکبوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی یان پەیوەندیان بە موختارەوە کرد.[٣]

هـ ـ دانەمەزراندنی کاربەدەستانی زرنگولێزان لە (کوفە) لە لایەن (ئیبن زوبێر)ەوە، وەك دیارە کاربەدەستانی ئەو لە قەد قۆناغەکە نەبوون بۆیە کاروباری کوفە لەژێر دەستیان دەردەچوو.[٤]

### ٢ ـ کۆتایی هاتنی موختار بە دەستی موسعەبی کوڕی زوبێر:

وا ڕەچاو دەکرا لەنێو چوونی موختار و بزوتنەوەکەی لە لایەك عبدالملك ئەنجامدرابایە، بەم کارەی تۆڵەی (ئیبن زیاد) و هەموو ئەو سەرکردە و سوپایەی کردبایەوە کە لە لایەن موختارەوە کوژراون و تەفر و تونا کران، بەڵام عبدالملك

١ـ عبدالله بن الزبير، للناطور ص:١٥٨.
٢ـ من دولة عمر إلى دولة عبدالملك ص: ٢٠٥.
٣ ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ عبدالله بن الزبير، للناطور ص:١٨٥.

دانی بە خۆدا گرت و زانی (ئیبن زوبێر) ئەم کارە ئەنجام دەدات و گوێ ناداتە ئەوەی کاتێك لە دژی سوپا هێرشبەرەکەی عبدالملك پشتیوانی لێکردووە،[1] چونکە (ئیبن زوبێر) نایەڵێ چی دیکە موختار پێ تێپەڕێنێ و دەسەڵاتی فراوان بکات و دەوڵەتەکەی بخاتە مەترسی یەوە، کەواتە بێگومان ڕۆژێك دێت و لە دژی ڕادەپەڕێ و ئەنجامی ڕووبەڕووبونەوەکەش بە قازانجی ئەو واتە: عبدالملك تەواو دەبێ، چونکە یەکیان ئەوی تریان لەنێودەبات و کامەشیان مایەوە بێ هێز و پێز دەبێت و لەنێوبرانی لەلایەن عبدالملك ەوە ئاسان دەبێت.

پێشبینیەکەی عبدالملك هاتە دی، موختار لە شەڕ فرۆشتن بە عبدالملك ڕانەوەستا و ویستی شەڕ بە (ئیبن زوبێر)یش بفرۆشێت، باکوری عێراق و جزیرەی لە عبدالملك داگیر کرد و ویستی (بصره)ش لە (ئیبن زوبێر) داگیر بکات و بڕیاریدا پەلاماری موسعەبی کوڕی زوبێری والی (بصرة) بدات، لێرە ڕا پێکهەڵشاخانی نێوان بزوتنەوەی موختار و بنەماڵەی (زوبێر) بووە شتێکی چاوەڕوانکراو و حەتمی.[2]

موسعەبی کوڕی زوبێر دەستی خۆی پێشخست و سوپایەکی گەورەی سازکرد و بەرەو جەنگی موختار بەڕێکەوت، لە (کوفە) گەمارۆیدا و تەنگی پێ هەڵچنی و بەسەریدا زاڵبوو، کوشتی و سەری لە لاشەی جودا کردەوە، فەرمانیدا هەردووك لەپە دەستی بە دەرگای مزگەوتی کوفەدا هەڵواسرێن، سەلکە سەرەکەشی بە پاسەوانی چەند چەکدارێك و بە بەریدی تایبەتدا بۆ (ئیبن زوبێر) بەڕێکرد، بەرید دوای نوێژی خەوتنان گەیشتە (مکە)، تەماشای کرد عبدالله خەریکی نوێژی سوننەتە، لەسەر نوێژ بەردەوام بوو تا سپێدەی بەیان هەلات، ئاوڕی لەو کەسە نەدایەوە سەلکە سەرەکەی هێنا بوو، گوتی: لەبەر دەرگای مزگەوت ـــی حەڕام ـــی دانێ، ئەویش داینا و هاتەوە لای، گوتی: بەخشش! ئەی ئەمیری ئیمانداران، گوتی: بەخششەکەت هەر ئەو سەلکە سەرەیە هێناوتە، هەڵیدەگری و لەگەڵ خۆت دەیبەیەوە بۆ عێراق.

---

١ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي ص:٤٨٤.

٢ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي ص:٤٨٥، البداية و النهاية(١١/٦٧).

دەوڵەتی موختار ئاسەواری سڕایەوە، وەك ئەوە هەر نەبووبێ، موسڵمانان بە شاد و خەندان بوون، چونکە خودی موختار لەناخیدا ڕاستگۆ نەبوو، بەڵکو درۆزن و کاهین و فێڵباز بوو، پڕوپاگەندەی دەکرد (جبریل) دێتە لای و وەحی بۆ دێنێ.[1]

ڕوفاعەی کوڕی شەدداد دەڵێ: کاتێك درۆزنی موختارم بۆ ئاشکرا بوو، شیرەکەم سوو و لە پشت سەری وەستا بووم وەك پاسەوان، بڕیارمدا لە ملی بدەم، لەو کاتەدا فەرموودەیەکم بە بیرهاتەوە، کە عەمری کوڕی بۆی گێڕاومەوە و دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (مَن أمَّن رجلاً على نفسه فقتله، أعطيَ لِواءَ الغدر يوم القيامة)،[2] واتە: هەر کەسێك چەپاڵەدانی کەسێك بە خۆ بگرێت و پاشان بیکوژێت، ڕۆژی قیامەت ئاڵای غەدر و پەیمانشکێنی دەدرێتێ.

بە (ئیبن عومەر) گوترا: موختاردەڵێ وەحیم بۆ دێ، گوتی: ڕاستە، خودا دەفەرموێ:

﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ﴾ (الانعام:١٢١)، واتە: شەیتانەکان وەحی بۆ دۆستەکانیان دەکەن.

عیکرەمە دەڵێ: چومە لای موختار، ڕێزی گرتم و لە پەنا خۆی داینیشاندم و بۆ شەو میوانداری کردم، دەڵێ: پێی گوتم: بچۆ دەرەوە و وتار بۆ خەڵك بدە، دەڵێ: چوومە دەرەوە، پیاوێك هات و گوتی: دەربارەی وەحی دەڵێی چی؟ گوتم وەحی دوو جۆرە: خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ (یوسف:٣)، واتە: هەروەها خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗا﴾ (الانعام:١١٢)، واتە: بەم شێوازە ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێکمان لە نێو شەیتانەکانی ئینس و جین دانا، هێندێك لەوان بۆ

---

١ـ البداية و النهاية(١١/٦٨).

٢ـ سنن إبن ماجة رقم(٢٦٨٨) حديث صحيح.

تەفرەدان قسەی بریقەداریان بۆ هێندێکی تر بە وەحی دەنارد، دەڵێ بۆم هاتن بمگرن، گوتم: ئەوە چی دەکەن؟ خۆ من موفتی و میوانی ئێوەم، جا وازیان لێهێنام، عیکرەمە ویستی بە ناڕاستەوخۆ درۆ و دەلەسەکانی موختار ـ ئەوانەی پەیوەندیان بە مەسەلەی وەحیەوە هەیە ـ پوچەڵ بکاتەوە و دەریخات کە درۆزنە.[1]

إبن کثیر دەڵێ: زانایان گوتویانە (کذّاب= درۆزن)ی نێو فەرمودەکە (موختاری کوڕی ئەبی عوبێد)ە، بە رواڵە شیعەگەری دەکرد و لە ژێرەوەش خەریکی هانەت بوو و لای کەسە دڵسۆز و نزیکەکانی دەیگوت: وەحیم بۆ دێ، بەڵام نەمزانیوە کە گوتبێتی پێغەمبەرم، تەخت و تاراجی بە ئاوریشم پۆشراوی بۆ دادەنرا و تەعزیم دەکرا و پیاوەکانی بە پێوە دەورەیان دەدا، بە تەخت و تاراجەکەیەوە ئێستر هەڵیدەگرت، تابوتەکەی بەنی ئیسرائیل چۆن باسی لێوە کراوە لە قورئانی پیرۆزدا، تەخت و تاراجی(موختاریش) ئەو حیسابەی بۆ دەکرا، بێگومان ئەو گومڕا و گومڕاکەر بوو، بە کوژرانی خودا موسڵمانانی ئاسوودە و حەساوە کرد، ئەمە دوای ئەوە بەهۆی ئەوەوە تۆڵەی خەڵکانێکی ستەملێکراوی لە خەڵکانێکی ستەمکار سەندەوە.[2]

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ (الانعام:۱۲۹)، ناردنی زەواڵ بۆ زاڵم سوننەتێکە لە سوننەتەکانی خودای پەروەردگار، تەماشاکردنێکی سادەی مێژوی مرۆڤایەتی و ئاڵوگۆڕی ژیانی کۆمەڵگاکان ئەمە دەسەلمێنێ.

**۳ ـ هۆیەکانی پوکانەوەی بزوتنەوەی موختار:**

أ ـ بێزرانی لەلایەن سەران و دەستڕۆیشتوانی عەرەب و پاشان دروستبوونی شەڕو گێچەڵ لە نێوان ئەوان و موختاردا، ئینجا ئەوانەی بە ساغی دەرچوون چوونە

---

۱ـ البداية و النهاية(۱۱/۶۹).

۲ـ هەمان سەرچاوە.

(بصره) و لەگەڵ سوپاکەی موسعەبی کوڕی زوبێر بە گژ موختاردا چوونەوە.

ب ـ تووشبوونی بە سەرسام بوون بە خۆ و چاو سووربوون: کار بەوە گەیشت بە کەسێکی وەك عومەری کوڕی عەلی کوڕی ئەبیتالیب بڵێ: بڕۆ بۆ کوێ دەچی بچۆ، هیچ خێروبێرێکت لای مە نیە!، هەر لەبەر ئەوە ئامادە نەبوو نامەیەکی بە ناوی محمدی کوڕی حەنیفەی بۆ تەزویر بکات،[١] ئەویش چووە لای موسعەب و لەگەڵ سوپاکەی ئەو هاتەوە کوفە.

ج ـ سوپا هێرشبەرەکەی موسعەب بۆ سەر موختار سوپایەکی گەورە و بەهێز بوو موصەللەبی کوڕی ئەبی سەفرەش بەشداریکرد و سوپاکەی بەهێزتر کرد، بەڵام سوپاکەی موختار هێندە گەورە و بەهێز نەبوو و ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەری سەرکردەی سوپاکەی موختار بەشداری جەنگەکەی نەکرد، بۆیە جەنگەکە نا بەرابەر بوو و بە دۆڕانی موختار تەواو بوو.

د ـ دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی درۆی موختار: شەعبی دەڵێ: ئیبن لحەنەفییە نامەی بە موختاردا نەناردبوو،[٢] و یەك نامەیشی بە نهێنی پێ نەدابوو، گومان کەوتە سەری، چونکە ئەوانەی لە دەورەیشی بوون نامەیان نەدیبوو، پیاو ماقوڵانی عەرەب بەمەیان زانی و گوتیان: ئەم موختارە درۆزنە.[٣]

هـ ـ وازلێهێنانی لەلایەن ئیبن لحەنەفیەوە: ڕۆژێك لە پەنا دەرگای (کەعبە) ڕاوەستا و ڕایگەیاند: (إنه كان كذاباً، يكذب على رسول الله)،[٤] واتە: ئەو موختارە پیاوێکی درۆزنە، درۆ بە دەم پێغەمبەری خوداوە هەڵدەبەستێ. زیاد لەمەش: (طبري) دەگێڕێتەوە: ئیبن لحەنەفییەنامەیەکی بۆ تاقمەکەی نوسی: بڕۆنە نێو کۆڕوکۆبونەوەکان و مزگەوتەکان و بە ئاشکرا و بە نهێنی زیکری خودا بکەن، جگە لە خەڵکانی موسڵمان کەس نەکەن بە سەرپەرشتی و ئەمینداری خۆتان، خۆ ئەگەر

---

١ـ تأريخ الدولة الاسلامية، إبن الصقطي ص: ١٢١، عبدالله بن الزبير، للناطور ص: ١٥٩.

٢ـ تأريخ الطبري، نقلاً عن عبدالله بن الزبير، للناطور ص:١٥٩.

٣ـ إمبراطورية العرب ص:١٥٦، غلوب، نقلا عن إبن الزبير، للناطور ص:١٥٩.

٤ـ الطبقات الكبرى(٥/١٥٨).

لە خۆتـان ترسـان ــ شـتێکتان بەسـەر بـێ ــ ئاگـادار و وریـا بـن پیـاوانی درۆزن و تەزویرچی زیان بە دینتان نەگەیەنن.[1]

و ـ داهێنانی شتێکی نامۆ لە ئیسلامدا لە لایەن موختارەوە: کە (تەخت و تاراج) بوو، بە هاوەڵانی گوت: هەر شـتێك لـەنێو ئوممـەتانی پێـشیندا هـەبووبێت، دەبێـت لـەنێو ئـەو ئوممەتەشـدا هـەبێت، لـەنێو (بـني إسـرائيل)دا (تـابوت) هـەبوو و بەشـە پاشماوەی بنەماڵەی موسا و هارونی تێدا هەڵگیرا بوو، ئەم تەختـەش لـەنێو ئێمـەدا وەك تابوتەکەی بەنی ئیسرائیلە. سەرەکەی هەڵدەنەوە، کە تەماشایان کرد: جـل و بەرگی موختاری تێدا بوو، کۆمەڵی (سەبەئیيە) واتە (شـیعە زێـدەڕۆکان) دەسـتیان بەرز کردەوە و ٣جار (ألله اكبر)یان گوت.[2]

ز- پێویستی زۆری (ئیبن زوبێر) بە عێراق: تاکە سەرچاوەی مـادی و مەعنـەوی و مرۆیی (ئیبن زوبێر) تەنها (عێراق) بوو لەو کاتەدا، چونکە شام و میـسری لەدەسـت دەرچـووبوون و مانـەوەی موختـاریش لـە عێراقـدا هەڕەشـە لـە پێگـەی سیاسـی و ئابوری دەکات و کۆسپێکی گەورەشە لە ڕێگەی دەستگەیشتنی بە وڵاتی فارس کـە تا ئەوکاتەش لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا مابۆوە.[3]

**٤ ــ فیرقەی (کیسانییە) و پەیوەندی بە موختارەوە:**

سەبارەت بە (کیسان) کە ئەم فیرقەیەی دەخرێتە پاڵ، ڕای جیاواز هـەن،[4] بـەڵام بە ڕای هەموو لایەك موختاری کوڕی عەبیدی سەقەفی لەگەڵ سەرهەڵدانی لە سـاڵی (٦٦)ی کۆچیدا سەرکردایەتی فیرقەکەی کردووە.

---

١- تأريخ الطبري، نقلاً عن عبدالله بن الزبير، للناطور ص:١٥٩.

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- عبدالله بن الزبير، للناطور ص:١٥٩.

٤ــ ئایا دەبێ ئەو (کیسان)ە: (کیسان)ی خزمەتکاری ئیمامی عەلی بێ کە لە جەنگی (سەمین) کـوژرا؟ یـان دەبێ (کیسان)ی شاگردی محمدی کوڕی حەنەفیە بێ؟ یان دەبێ (کیسان)ی سەرۆکی پاسەوانەکانی موختـاری سەقەفی بێ؟ یان هەر خودی (موختار)ە، چونکە بە (کیسان) بانگ دەکرا و ناسناوی (أبـوعمرة و أبـو اسـحاق) بێ؟ (الملك و النحل١/١٣٢).

(فیرقەی کیسانی): بریتیە لە تاقمێك شیعەی زێدەڕۆ (الغلاة)و لە دین دەرچوو، موختاری سەقەفی یەکەمین کەس بوو بیری مەهدیایەتی لە کەسایەتی محمدی کوڕی حەنەفییەدا زەق کردەوە و ناسناوی (مەهدی) بەسەردا بڕی، هەروەها بیری (بَداء) واتە کەشف و بینینی پێشی بەکاردێنا، لە ساڵی٦٧ی کۆچیدا و کەمێك پێش کوژرانی ئەم (بیرە)ی لێ بڵاوبۆوە، جێی باسە بیری (بەدائە) و کەشف و پێشبینی سەرەتا لەلایەن ڕافیزەکانەوە بەکاردەهێنرا و پاش ئەوانیش موختار پڕوپاگەندەی بۆ ئەم بیرە چەوتە دەکرد، موختار پێشبینی سەرکەوتنی هاوەڵەکانی دەخستە ڕوو، کاتێك دەشکان و دەدۆڕان، دەیگوت: خوا بۆی دەرخستبوو،[1] ئەم بیرە شەیتانیە پایە و پێگەی پێدابوو و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕاکانی دەگۆڕین، زیاد لەمەش لە ڕواڵەتدا خۆی وەك پێغەمبەرێك نیشاندەدا، بیری داهێنانی (تەخت و تاراج)یشی دەخستە پاڵ ئیمامی عەلی رضي الله عنه و چەندین بیر و ڕای تری هەڵبەستراوی دیکەشی بڵاودەکردەوە.[2]

بیروباوەڕی (کیسانییە) لە تونێلە تاریکەکەی شەیتانەوە فراژوو بوو و بڵاوبۆوە، ئیمامەتی محمدی کوڕی عەلی ناسراو بە ئیبن لحەنەفییەیان ڕاگەیاند بە پاساوی ئەوە ئەو لە (بصرە) ئاڵای داوەتە دەست موختار،[3] بیری تەناسوخ و ئاڵوگۆڕی ڕۆحەکانیان بڵاو کردەوە، دەیانگوت: ئیمامەت بۆ عەلی هاتووە، پاش ئەو بۆ حەسەن و ئینجا بۆ حوسێن و دوای ئەویش بۆ محمدی کوڕی حەنەفییە، واتای ئەمە ئەوەیە: ڕوحی خودا هاتۆتە نێو لاشەی پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆحی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتۆتە نێو لاشەی عەلی، ڕۆحی عەلیش هاتۆتە نێو لاشەی حەسەن، ڕۆحی حەسەنیش هاتۆتە نێو لاشەی حوسێن، ڕوحی حوسێنیش هاتۆتە نێو لاشەی ئیبن لحەنەفییە، هی ئەویش هاتۆتە نێو لاشەی ئەبوهاشمی کوڕیەوە.[4] دەربارەی ئیبن لحەنەفییە زۆریان زێدەڕۆیی دەکرد و دەیانگوت: دەورەی هەموو زانستەکانی داوەو

---

١ــ الفرق بين الفرق ص:٥٥،٥٦، دراسات في الاهواء و الفرق ص:٢٤٨.

٢ــ نشأة الحركات السياسية و الدينية في الاسلام، د.فاروق فوزي ص:١٠١.

٣ــ المقالات و الفرق ص:٢٦، الشيعة العربية و الزيدية ص:٢٥٨.

٤ــ (الملك و النحل١/١٣١).

زانیاریەکانی ئاشکرا و پەنهان و تەواوی گەردوون و مرۆڤ دەزانێت، ڕاز و زانیاریەکانی لە دوو سەیدەکەی پێش خۆی واتە حەسەن و حوسێن وەرگرتووە.[١]

لە ڕاستیدا ئیبن لحەنەفییە: هەرگیزا و هەرگیز نەیگوتووە من مەهدیم و لە ڕاز و نهێنیەکان دەزانم و دانی بەم جۆرە زێدە ڕۆییانە نەناوە.

ئیبن سەعد لە گێڕانەوەیەکیدا کە بۆ (ئەبولغوریانی مەجاشینی) بەرزکردۆتەوە، دەڵێ: هەواڵ گەیشتە (محمدی کوڕی حەنەفییە): کە ئەوان دەڵێن (محمد) شتێکی لە زانیاری پەنهان لەلایە، گوتی (محمد) هەستایە سەر پێ لەنێوماندا و گوتی: سوێند بە خودا، ئێمە جگە لەم شتەی لەنێو ئەم دوو لەوحەدایە شتێکی زیاترمان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە میرات وەرنەگرتووە)، ئینجا گوتی: خودایە جگە لەم لاپەڕەیە کە بە دەسکی شیرەکەمەوەیە، پرسیارم لێکرد: ئەم لاپەڕە چی تێدا نوسراوە؟ گوتی: (مَن أحدث حَدَثاً، أو آوى مُحدثاً).[٢]

(محمد) لە وەلامی هێندێك پرسیاری پیاوێك کە دەربارەی هێندێك شتی نهێنی بۆی دروست ببون گوتی: دوای ئەمە: لەم جۆرە قسە و باسانە دوربکەونەوە، دەنا شوڕەیی و نەنگی یە بۆ ئێوە خۆ بەم شتانەوە خەریك دەکەن، دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزەوە، پێشینانتان بەهۆی قورئانەوە ڕێگەی ڕاستیان گرتە بەر، دوا کەسی ئێوەش هەر بەهۆی ئەو ـ قورئان ـ ەوە ڕێگەی ڕاست دەگرێتە بەر.[٣]

موختار لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی ڕەواجی بە بیری مەهدیاتی محمدی کوڕی حەنەفییە داوە، واتە ئەو ویستویەتی بە ناوی ئەوەوە حوکم بگێڕێت و بەس و یەکتۆز بەشداری پێنەکات، کاتێك ئیبن لحەنەفییە ویستی بەرەو (کوفە) بچێت، ئەم هەواڵە گەیشتە موختار و زۆری لەبەر دڵ گران بوو، گوتی: مەهدی نیشانەیەکی هەیە، ئەو دێتە نێو شارەکەتانەوە، پیاوێك لە ئێوە بە شیر لێی دەدا، بەلام شیرەکە نایبڕێت و زیانی پێ ناگەیەنێ، ئەم نەخشەیە گەیشتەوە بە ئیبن

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ الشيعة العربية و الزيدية ص:٢٥٨.

٣ـ الطبقات(٥/٧٠).

لحەنەفییە، ئەویش نەچوو و لە جێگای خۆی مایەوە.[١]

کثیر عزەی شاعیر دەربارەی ئیبن لحەنەفییە گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| الا إن الأئمـــة مـــن قـــريش | ولاة الحـــق أربعـــة ســـواء |
| علـــيٌّ و الثلاثـــة مـــن بنيـــه | هم الأسباط ليس بهم حنفاء |
| فـــسبط ســـط إيمـــان و بـــرّ | وســـيط غيبتـــه كـــربلاء |
| وســـيط لا تـــراه العـــين حتـــى | يقـــود الخيـــل يقودهـــا لـــواء |
| تغيَّـــب لا يُـــرى عـــنهم زمانـــاً | برضـوى عنـده عـسل ومـاء.[٢] |

## شەشەم: بزوتنەوەی عەمری کوڕی سەعیدی کـوڕی عـاص (الاشـرق) و کوژرانی.

بەپێی بڕیارەکانی کۆنگرەی (جابیە)، دەبوایە دوابەدوای مەڕوانی کوڕی حەکـەم و خالیـدی کـوڕی یەزیـد. عـەمری کـوڕی سـەعیدی ئەشـرەق پۆسـتی حـوکمڕانی وەربگرێ، بەڵام مەڕوان حیسابی بۆ عەمر نەکرد و لـە حـاڵی حەیاتیـدا بەیعـەتی بـۆ هــەردوك کوڕەکــەی خــۆی عبــدالملك و (عبــدالعزیز) ڕێکخــست، ئــەم ڕەفتــارەی (مەڕوان) ئاگری ڕقی لە دەروونی عەمردا هەڵایساند، بـەڵام خالیـد نـەیکردە خـەم و مەراق و ڕووی لە لێکۆڵینەوەی زانست کرد، بەتایبەتی زانستی کیمیاگەری.[٣]

سەرەتای ساڵی٦٩ی کۆچـی عبـدالملك بەمەبەسـتی گـەمارۆدانی زوفـەری کـوڕی حاریس بە خۆی و بـە سـوپاکەیەوە بـەرەو (قەرقیـسیا) بەڕێکـەوت، عـەمری کـوڕی سـەعیدی بەسـەر (دیمەشـق)ەوە بەجێهێـشت، هـەر کـە عبـدالملك دەرچـوو، عـەمر دیمەشقی پاوانکرد و خۆی تێدا دامەزراند و دەستی بەسەر بەیتولماڵەدا گرت.

بەپێی گێڕانەوەیەکی تر: کاتێك عبدالملك بـەرەو(قرقیـسا) بەڕێکـەوت عەمریـشی لە گەڵدا بوو، بە لە شـەودا هـەڵی قۆزتـەوە و بـەخۆ و بـە ژمارەیـەکی زۆرەوە جـودا

١ـ سير أعلام النبلاء(١١٨/٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە (١١٢/٤).

٣ـ تأريخ خلافة بني أمية، بنيه عاقل ص:١٥٢.

بۆوە و بەرەو (دیمەشق) گەڕایەوە، (عبدالرحمن ی کوڕی ئوم حەکەمی سەقەفی)ی والی دیمەشق هەڵات و عەمری کوڕی سەعید چووە نێویەوە و دەستی بەسەر خەزێنەکانیدا گرت،[١] عەمر لە دو (عبدالرحمن)ی نارد، بەڵام لەوێ نەمابوو، فەرمانیدا خانووەکەی بڕوخێنرێ، خەڵك کۆبۆوە و عەمر چووە سەر (مینبەر) و سوپاس و ستایشی خودای کرد و گوتی: ئەی خەڵکینە: هەر کەسایەتیەکی قوڕەیشی لە پێش مندا چووبێتە سەر ئەم مینبەرە، پێی وابووە بەهەشت و ئاگری هەیە، کێ فەرمانبەرداری بێ دەچێتە بەهەشت، کێ یاخی بێ دەچێتە دۆزەخ، من هەواڵتان پێ دەدەم: بەهەشت و دۆزەخ هی خودان و هیچ کامێکیان هی من نین، من تەنها ئەوەم لەسەر شانە: بە یەکسانی یەکی چاك و بەخشینی تێر و تەواو ڕەفتارتان لەگەڵ بکەم.[٢]

سپێدەی بەیانی ئەو شەوە: عبدالملك دەربارەی عەمر پرسیاری کرد، زۆری لێگەڕان نەیاندۆزیەوە، یەکسەر بەرەو (دیمەشق) گەڕایەوە، تەماشای کرد عەمر خۆی تێدا مەڵاس داوە، جەنگ و پێکهەڵشاخان دەستی پێکرد، (١٦) ڕۆژی خایاند ئەنجامی نەبوو،[٣] عبدالملك تەماشایکرد عەمر خۆی لە قەڵایەکی پتەوی ڕۆمی دا مەڵاسداوە بەزینی ئەستەمە، ناچار داوای لە عەمر کرد. ئاشتی بکەن و شەڕ ڕابگرن.[٤]

**١ ــ مەرجەکانی (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص): بەم شێوەیە بوون:**

ـ دەبێ پۆستی (خیلافەت) دوای عبدالملك بۆ عەمر بێ.[٥]

ـ دەبێ لەگەڵ هەرکاربەدەستێکی عبدالملکدا کاربەدەستێکی عەمرش هەبێت و لە هەموو کاروبارێکی گەورە و بچوکدا ڕاوێژی پێ بکات.[٦]

ـ دەبێ عەمر بە سەرپەرشتیاری (دیوان) و (بیت المال) دامەزرێنێ.[١]

---

١ـ البداية و النهاية(١١/١١٤).
٢ـ هەمان سەرچاوە (١١/١١٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ الامويين، للوكيل(١/٣٦٩).
٥ـ الدور السياسي لأهل اليمن في الشام ص:٨٥.
٦ـ تأريخ خليفة، نقلاً عن الدور السياسي لأهل اليمن ص:٨٥.

لەلایەکی ترەوە کتێبەکانی مێژوو ژمارەیەك هۆکاریان باسکردوون، بۆ قبوڵکردنی ئەم مەرجانەی عەمر لەلایەن (عبدالملك)ەوە:

أ ـ دابەشبوونی هۆزی (کەلب)ی خاوەن هێز و کاریگەری سیاسی، بەسەر عبدالملك و عەمردا، برا کوژی ئەم هۆزە زیانی گەورەی بۆ هەردولا تێدایە و بەرژەوەندی (کەلب)یش دەخاتە خەتەرەوە، ئەمە هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ ئاشتی.[2]

ب ـ دەستبەسەرداگرتنی دیمەشقی پایتەخت لە لایەك و زەوتکردنی (بەیتولماله) و (دیوان) کە بە دوو شارەگی ژیانی و ڕاکێشانی پشتیوانان دادەنران بۆ دەوڵەتی ئومەوی لەلایەن (عەمری ئەشرەق).

ج ـ مانەوەی زۆربەی هێزە یەمانیەکانی تری شام بەبێلایەنی و دوورە پەرێزی یان، وایکرد بڕیاری ڕەسمی ئاشتی بە دەستی خودی هۆزی (کەلب) بێت.[3]

د ـ دەرکەوتنی بزوتنەوەی عەمری ئەشرەق وەك زلهێزێکی سەربازی و پشتیوانی لێکردنی لەلایەن دانیشتوانی (دیمەشق) و عبدالله ی کوڕی کریزی قەسری ی سەرۆکهۆزی (بەجیلە) بەخۆی و هۆزەکەیەوە.[4]

هـ ـ دەشگونجێ بۆیە عبدالملك لەگەڵ عەمر ڕێکەوتبێ، تا کێشەکە بە ئاشتی چارە بکات و دوایەش لەگەڵ سەرۆکهۆزەکانی شام پێك بێت و (عەمری کوڕی ئەشرەق)یش بەهەرجۆرێك بێت لەنێوبەرێ.[5]

### ٢ ـ عبدالملك و ناپاکی کردن لەگەڵ عەمری کوڕی سەعیدی پورزای:

دوای تێپەڕینی (٤) ڕۆژ بەسەر پەیمانی ئاشتی و هاتنەوەی عبدالملك بۆ نێو (دیمەشق)، عبدالملك بە دوای عەمری دا نارد بێتە لای، پاشنیوەڕۆ عەمر خۆی

---

١ـ أنساب الاشراف(٤/١٣٩).
٢ـ نهاية الأدب(٢١/١٠٢)، الدور السياسي لأهل اليمن ص:٨٦.
٣ـ الدور السياسي لأهل اليمن ص:٨٧.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ الكامل في التاريخ، نقلاً عن الدور السياسي لأهل اليمن ص:٨٧.

زرێپۆشکرد و شیری لە کالان دەرکێشا، هەستایە سەر پێ و بەسەر ڕایەخەکەدا هەڵەنگوت، ژنەکەی و ئەوانەی لەلای بوون، گوتیان: ئێمە بە باشی نازانین بچیتە لای عبدالملك، بەڵام بە قسەی نەکردن، بەخۆ و بە (١٠٠) کۆیلەی تایبەتی خۆیەوە بەڕێکەوت، عبدالملك فەرمانی بە ڕۆڵە و نەوەکانی (مەڕوان) کردبوو بێنە دەورەی، بە دەرگاوانەکەی گوتبوو: کە (ئیبن سەعید) بەتەنیا بنێرێتە ژوورەوە و دەرگا دابخات، عەمر لە دەرگا ئاوا بوو و دەرگاکان داخران، لە عبدالملك نزیك بۆوە، پێشوازیلێکرد و لەسەر قەنەفە داینیشاند، پاشا ئاخاوتنێکی دوور و درێژ، عبدالملك گوتی: هۆ کوڕە شیرەکەی لێوەربگرە، عەمر گوتی: (إنا لله) ئەی ئەمیری ئیمانداران. پێی گوت: بەتەمای قسەم لەگەڵ بکەی و شیریشت پێ بێ!. ئینجا کوڕیژگەکە شیرەکەی لێ وەرگرت، ماوەیەك گفتوگۆیان کرد، ئینجا عبدالملك ڕووی لە عەمر کرد و گوتی: هۆ باوکی ئومەییە! عەمر گوتی: لە خزمەتدام، ئەی ئەمیری ئیمانداران، گوتی: تۆ کە منت لە جێنشینایەتی خست و کودەتات بەسەردا کردم، ئەو کاتە سوێندم خوارد: هەر کاتێك بکەویتە بەردەستم و پڕ بە چاوانم بتبینم، دەبێ سەرتاپا کۆت و زنجیرت بکەم، ڕۆڵەکانی (مەڕوان) گوتیان: دوای ئەوە ئازادی دەکەی ئەی ئەمیری ئیمانداران؟ گوتی: ئینجا ئازادی دەکەم! چۆن شتی وا لەگەڵ (بابی ئومەییە) دەکەم؟!، ڕۆڵەکانی مەڕوان گوتیان: سوێندەکەی ئەمیری ئیمانداران بەجێبگەیەنە، عەمر گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران سوێندەکە بەجێدەگەیەنم، عبدالملك کۆت و زنجیرێکی لەژێر ڕایەخەکەی دەرهێنا و بۆی هەڵدا، ئینجا گوتی: هۆ کوڕە! زنجیری بکە. کوڕەکە کۆتوزنجیری کرد، عەمر گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران توخوا کاتێك دەمبەنە دەرەوە و لەبەر چاوی خەڵك لێم بکەنەوە گوتی: ئەی بابی ئومەییە لەکاتی سەرەمەرگدا دەتەوێ مەکر و فێڵ بکەی؟ نا بەخوا. نامانەوێ لەبەر چاوی خەڵك لێت بکەینەوە،دەبێ کۆتوزنجیرەکەت بە ئازار و ئەشکەنجەوە لێداماڵین،

ئینجا عبدالملك بە هەردوك چەپەڵۆکی پڕی دایە و ڕایکێشا، بەجۆرێك دەمودانی بە قەنەفەکە کەوت و ددانی پێشەوەی شکاند، عەمر گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران

توخوا با لەمە گەورەتر نەشکێت، عبدالملك گوتی: بە خوا ئەگەر بزانم تۆ بمێنی و وەفادارم بی و قورەیش ئاشت و تەبا بکەی ئازادت دەکەم، بەڵام دوو پیاوی وەك منوتۆ لە وڵاتێکدا پێکەوە کۆنابنەوە بەڵکو یەکێکیان ئەوی تریان دەردەکات.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە:

عبدالملك عبدالعزیزی برای ڕاسپارد، تا لە نوێژی عەسر دەگەڕێتەوە بیکوژێت، گەڕایەوە، بینی نەیکوشتووە، سەرکۆنەی عبدالعزیزی کرد و جنێوی بەخۆی و بە دایکی گوتن هەریەکەیان لە دایکێك بوون، عبدالعزیز گوتی: خودا و خزمایەتی بە گژدا کردم چونکە دایکی پوری عبدالملك بوو و خوشکی مەڕوان بوو، ئینجا عبدالملك گوتی: هۆ کوڕە! ئەو سەرە نێزەم بۆ بێنە، بۆی هێنا، ڕایوەشاند و لێیدا، بەڵام سوودی نەبوو، ئینجا دەستی لە بازۆڵەی عەمر وەشاند، زانی زرێی لەبەرە و پێکەنی و گوتی: خۆ زرێپۆشە، کەواتە خۆت ساز کردووە، هۆ کوڕە شیرەکە بێنە، شیرەکەی هێنا، ئینجا فەرمانیدا عەمر بخرێتە زەوی، لەسەر سنگی دانیشت، سەری بڕی و دەیگوت:

یا عمرو إن لم تدع شتمی و منقصتی    أضربک حیث تقول الهامة اسقونی

دەست و پەنجەکانی لە خوێند شەلاڵ ببون و خوێنیان لێ دەتکا، باسکەکانی شۆڕببونەوە و لەرەلەریان دەکرد، سام گرتبووی و نەیدەتوانی لەسەر سنگی ڕاست بێتەوە، ئامادەبوان هەڵیانگرت و لەسەر قەنەفەکەی خۆی دایانیشاند و دەیگوت: بەر لەمە شتی ئاوام نەدیبوو، هاودەمی دنیا بوو، خوازیاری دوا ڕۆژ نەبوو، ئینجا سەرەکەی دا بە عبدالرحمن ی کوڕی ئوموحەکەم. ئەویش بردیە دەرەوە و لەبەرامبەر خەڵك ڕاینواند، عبدالعزیزی کوڕی مەڕوان تورەکەیەك پارەی هەڵگرت و چووە دەرەوە، دەمی کیسەکەی کردەوە و بەنێو خەڵکی دا هەڵدا، ئەوانیش فڕان فڕانیان لەسەر کرد، گوتراوە: پاشان پارەکە بۆ بەیتولماڵ گێڕدراوەتەوە،

---

[1] ـ البدایة و النهایة(١١/١١٧).

دەشگوترێ: کاتێك عبدالملك بۆ نوێژی عەسر دەرچوو، ئەبو زوعەیزەعەی کۆیلەی سەرپەرشتی کوشتنی عەمری کردووە.[1]

بەم شێوەیە عبدالملك خۆی لە مەترسی مونافیسێکی بەهێزی ڕزگار کرد و گوێی بە پەیمان و پەیمانشکێنی نەدا، ناپاکی کرد، خوێنی ڕشت، لە پێناوی گەیشتن بە دەسەڵات عەمری کوڕی سەعیدی پورزای کوشت، موسعەبی کوڕی زوبێری یەکە خۆشەویست و هاوڕێی خۆی لەنێوبرد، عبدالله ی کوڕی زوبێری باشترین کەسی سەر زەوی ئەو زەمانەی خۆی گوتەنی کوشت.

## حەوتەم: ئاشتی عبدالملك لەگەڵ (ڕۆم) و تەنگهەڵچنینی بە (جەڕاجیمە).

بەرەچاوکردنی پشێوی و ئاڵۆزی زۆری نێو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئومەوی، عبدالملك بە ناچاری ئاشتینامەیەکی لەگەڵ (ڕۆم) مۆر کرد، بەپێی ئەمە:

- دەبێ دەوڵەتی عبدالملك ساڵانە (٣٦٥) هەزار پارچە زێڕ و (٣٦٠) کۆیلە و (٣٣٠) ئەسپی ڕەسەن بدا بە (ڕۆم).

- دەوڵەتی ئومەوی و دەوڵەتی ڕۆم باج و دەرامەتی (قوبرس و ئەرمینیا) بە یەکسانی بەسەر خۆیاندا دابەش بکەن،[2] عبدالملك ژمارەیەك بارمتەی لێکلدانەوە و لە (بەعلەبەگ) دانیان،[3] لە بەرامبەر ئەمەدا دەبێ (ڕۆم) (جەراجیمە) بکێشێتەوە نێوەڕاستی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی.[4]

عبدالملك ئاشتی (جەڕاجیمە)ی لە چیای (الکام) قبوڵ کرد و، ئامادەبوو هەموو ڕۆژانێکی هەینی (١٠٠٠) دیناریان بداتێ.[5]

---

١ ـ البداية و النهاية(١١/١١٩).

٢ـ الفتوح البيزنطية ص:١٥٨، الدور السياسي لأهل اليمن ص:٩٠.

٣ـ فتوح البلدان(١/١٩٠).

٤ـ فتوح البلدان(١/١٩٠)، الدور السياسي لأهل اليمن ص:٩٠.

٥ـ أنساب الاشراف(٥/٢٩٩،٣٠٠)، الدور السياسي لأهل اليمن ص:٩٠.

هێندەی نەخایاند هەلی وەرگرت و خۆی مەترسی (جەڕاجیمە) ڕزگار کرد، دوای ئەنجامدانی پەیمانی ئاشتی لەگەڵیان، یەك لە سەرکردەکانی خۆی بە ناوی سەحیمی کوڕی موهاجیری بۆ لای سەرۆکی (جەڕاجیمەکان) نارد، متمانەی تەواوی پێکرد، بە هێزێکی گەورەی سەربازی یەوە  کە بۆ ئەم کارە ڕێکی خستبوو لێی نزیك بۆوە بەرەنگاریان بۆوە، لە ئەنجامدا سەرکردەکەیان کوژرا و هاوەڵەکانی هەڵاتن و ئەوانەی بەجێمان چەپاڵەدران و کۆیلەکان گەڕانەوە لای گەورەکانیان و پیشەوەر و جوتێرەکانیشی بۆ سەر گوندەکانیان گەڕانەوە.[١]

وەك دەردەکەوێ ئەم ڕێکەوتنەی عبدالملك لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتی هێندەی نەخایاندووە، چونکە(ڕۆم) پەیمانەکەیان شکاند، هەروەها عبدالملك، توانی(ئیبن زوبێر) لەنێوبەرێت و دەوڵەتی ئیسلامی بکات یەك و خۆیشی تاکە سەرکردە بێ، ئەم سەرکەوتنەی هانیدا بیر لە بەرەنگاربوونەوەی بێزەنتی یەکان بکاتەوە کە بەردەوام سەرەتاتکەی سەر سنوری جیهانی ئیسلامیان دەکرد، ساڵی٧٣ی کۆچی (محمدی کوڕی مەڕوان)ی برای[٢] بۆ سەرکردایەتیکردنی هێرشەکان دیاریکرد و لە ساڵی ٧٤ی کۆچیدا دەستی بە هێرشکرد.[٣]

## هەشتەم: ( زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی ).

قەیسیە هەوادارەکانی (ئیبن زوبێر) دوای جەنگی (مەرج ڕاهیت)یش بەردەوام بوون لەسەر بیری تۆڵە، زوفەری کوڕی حاریس یەکێك بوو لە سەرکردە بەهێزەکانی ئەو هۆزە، بەخۆ و بە هۆزی قەیسەوە لە (قەرقیسا) خۆیان مەڵاس دابوو، ئەم شارەیان کردبووە وێستگەی هێرشەکانیان بۆ سەر هۆزی کەلب، لەسەر ناوچە سنوریەکان، عبدالملك بەمە زۆر تەنگاو بوو، ئەو کە بە نیاز بوو تەواوی ناوچەکان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی (ئیبن زوبێر) دەربێنێ، بەتایبەتیش (عێراق) کە

---

١ـ أنساب الاشراف(٥/٣٠١).

٢ـ الکامل لإبن الأثیر، نقلاً عن الدور السیاسي ص: ٩٢.

٣ـ هەمان سەرچاوە (٣/٨٤).

موسعەبی کوڕی زوبێر حوکمی تێدا دەگێڕێ، بۆیە بڕیاریدا پێش ئەوەی هیچ کام لە بەرنامەکانی دەست پێ بکات دەبێ هێرش بکاتە سەر (قەرقیسیا) و خۆی لە مەترسی (زوفەر) ڕزگار بکات، ئەو سوپایەی بۆ هێرشکردنە سەر موسعەبی سازکردبوو ڕووی پێ بەرەو (قەرقیسیا) وەرگێڕا، پێشەکی گەمارۆیدا، بەڵام پیاوەکانی (زوفەر) دەستپێشخەری هێرشێکی پاڵوانانەیان کردە سەر سوپاکەی عبدالملك، عبدالملك بەم هێرشەیان سەرسام بوو و گوتی: دەك خودا پیاوانی (موزەڕ) لە ڕەحمەتی خۆی دەرکا!، بەخوا شەڕ لەگەڵ کردنیان داماوی بە دواوەیە و وازلێهێنانیان داخ و حەسرەت و مەراقە!.[١]

عبدالملك پەنای بۆ ئاشتی برد، نامەیەکی بۆ (زوفەر) نارد، داوای لێکردبوو گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداربێ دەنا بە پێچەوانەوە توشی مەترسی دەبێت، دوای هەوڵدانێکی زۆر و ئاخاوتنێکی دوور و درێژ (زوفەر) وەڵامی داواکەی بە ئەرێ و بەڵێ دایەوە، بەمەرجێك هەڵبژاردن بەدەست خۆی بێ: یان وەك دڵسۆزێکی (ئیبن زوبێر) دەمێنێتەوە، یان دەچێتە پاڵ عبدالملك، عبدالملك ڕازیبوو و بڕیاریدا (زوفەر)و (هوزەیل)ی کوڕی، کە سەرکردەی سوپاکەی بوو و تەواوی لایەنگرانیان و چەپاڵە بدات و داوای تۆڵەی خوێنی ڕژاو وماڵی لەنێوبراویان لێ نەکاتەوە، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا عبدالملك ماڵ و پارەیەکی زۆری دا بە (زوفەر) تا بەسەر خۆی و قەیسیەکانیدا دابەش بکات، ئینجا کۆتایی ئەم کارەیان بە ئەنجامدانی هاوسەرگیری هێنا لەنێوان موسلمەی کوڕی عبدالملك و ڕەبابەی کچی زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی، (زوفەر) فەرمانی بە (هوزەیل)ی کوڕی کرد بچێتە ڕیزی سوپاکەی عبدالملك کە بۆ هێرشکردنە سەر موسعەبی کوڕی زوبێری ڕێکخستووە، چونکە (هوزەیل) وەك خۆی بەیعەتی (ئیبن زوبێر)ی لە ئەستۆدا نیە).[٢]

عبدالملك بەرنامەی دانا بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگی لە نێوان هەردوك هۆزی یەمانی و قەیسی، سەرکردە و کەسایەتی هەردوك لای بە تەرازوو لە خۆی نزیك کردنەوە، لە هۆزی (قەیس) ئەم جۆرە کەسایەتیانەی لە خۆ نزیك کردنەوە:

---

١ـ الكامل في التاريخ(٣/٦١).
٢ـ هەمان سەرچاوە(٣/٦٢).

زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی، هوزەیلی کوڕی زوفەر، کەوسەری کوڕی زوفەر، مەسعەدەی فەزاری، ژمارەیەکی تریش.

لە هۆزی (یەمانی)یش ئەم کەسایەتیانەی لە خۆی نزیك کردنەوە: حەسسانی کوڕی مالیکی کەلبی، ڕوحی کوڕی زەنباعی جوزامی، ڕەجائی کوڕی حەیاتی کیندی، ژمارەیەکی تریش.

هاوسەنگی تەواوی لەنێو ئەم دوو هۆزە گەورەی شامدا ڕاگرت لە تەواوی کۆڕ و کۆبوونەوە و ئەنجامدانی کارەکانیدا، بە زۆری کاربەدەستی نێو شارەکانی لە هۆزی قەیسی دادەمەزراندن، و کاربەدەستی سەر گوند و لادێکانیشی لە خەڵکانی هۆزی یەمانی دادەنان. و هەروەها.[1]

## نۆیەم: زەوتکردنی (عێراق) و کۆتایی هێنان بە موسعەبی کوڕی زوبێر:

دوای ئەوەی (ئیبن زوبێر) تەواوی عێراقی خستەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتەکەی خۆی، ڕووبەڕوو بوونەوەی نێوان ئەو و عبدالملك بووە شتێکی چاوەڕوانکراو و حەتمی، عبدالملك پاش ڕاوێژ کردنی بە دەست و پێوەندەکانی، بڕیاریدا بە سەرکردایەتی خودی خۆی هێرشێکی گەورەی سەربازی بکاتە سەر موسعەبی کوڕی زوبێر، هەندێك ڕاوێژکار ڕایان وابوو خۆی لە شام بمێنێتەوە و یەکێك لە کەسوکاری نزیکی سەرکردایەتی سوپاکە بکات، هەندێکی تریش ڕایان وابوو خودی خۆی بەم کارە هەستێ، خۆیشی ئەم ڕایەی دووەمی هەبوو و گوتی: ئەم کارە گرنگە تەنها بە کەسایەتیەکی قورەیشی خاوەن بیروڕای پەسند ڕادەپەڕێ، لەوانەیە کەسێك بنێرم ئازا بێت، بەڵام خاوەن ڕا نەبێت، من شارەزای تاکتیکەکانی جەنگم، لەشەڕە شیرو شیربازیشدا شارەزام ئەگەر پێویست بکات، موسعەب ئازایە و پەروەردەی نێو بنەماڵەیەکی بەغیرەتە، بەڵام لە تاکتیکی جەنگ نازانێ و خەڵکانێکیشی لەگەڵە دژو پێچەوانەی دەجوڵێنەوە، بەڵام من خەڵکانێکم لە پشتە دڵسۆزیم بۆ

---

١ـ الدولة الاموية المفترى عليها ص: ٣٨٦.

دەنوێنن[١] ساڵی٧١ی کۆچی و دوای تێپەڕینی (٤) ساڵ بەسەر لەنێوچوونی موختار و دەسەڵاتەکەی، عبدالملك بڕیاری خۆی ساغ کردەوە پەلاماری عێراق بدات و لەژێر دەسەڵاتی (ئیبن زوبێر)ی دەربێنێ، لەوانەیە تا ئەو ساتە وەختە تێکهەڵچونەکانی لەگەڵ ئیبن زوبێر لە عێراقدا شێوە ئەنقەست بووبن، چونکە تا پایەکانی حوکمڕانی لە شام نەچەقاندن نەیویستووە بەرەو عێراق بەڕێ بکەوێ، ئەم ساڵانەی بەڕێ کردن تاوەکو پێویستە بتوانێ ئەم ئامانجە بپێکێ، هەروەها کێشەکانی خۆی لەگەڵ زوفەری کوڕی حاریسی کیلابی چارەسەر کردن کە خۆی لە (قەرقیسیا) دامەزراند بوو،[٢] دەسەللاتی ئومەوی لە تەواوی جزیرە پێلێژ کردبوو، عبدالملك بە لێزانی و سیاسەتی بەهێزی کێشەی (زوفەر)ی ئاشتیانە چارەسەر کرد، بەم شێوازە کێشەی (قرقیسیا)ی کۆتایی پێهێنا، کە ماوەی حەوت ساڵ بوو وەك درکێك لە چاوی دەوڵەتی ئومەوی هەڵچەقیبوو، ئەم کێشەی ئاشتیانە چارە کرد و دەسەڵاتی لە هەرێمی (جزیرە) جێگیر کردەوە،[٣] هەر لەم چەند ساڵەدا خۆی لە عەمری کوڕی سەعیدی گەورە خۆڕەپێشکەری سامناکی ڕزگار کرد و گرتی و کوشتی.[٤]

کاتێك ویستی بەرەو عێراق بەڕێبکەوێ، خوا حافیزەی لە عاتیکەی کچی یەزیدی کوڕی معاویەی هاوسەری کرد، عاتیکە گریاو کارەکەرەکانیاش لەگەڵی گریان، عبدالملك گوتی: خودا(کثیر عزة) بکوژێ، ئێستا هەردەڵێی چاوی لێمانە و دەڵێ:

إذا ما اراد الغزو لم يثن همه حِصانُ عليها عقد در يزينها
نهته فلما لم تر النهي عاقه بكت و بكى مما عناها قطينها[٥]

ئینجا عبدالملك بە خۆی و بە سوپاکەیەوە بە پەلە پەل بەرەو عێراق ڕۆی، محمدی کوڕی مەڕوانی برای کردە پێشەنگی سوپاکە و لە (مەسکەن) بارگەیان

---

١ـ الكامل في التاريخ(٣/٥١).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٣/٥٩).
٣ـ الكامل في التأريخ، نقلاً عن العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص: ٥٠١.
٤ـ البداية و النهاية(١١/١١٩).
٥ ـ الكامل في التاريخ(٣/٥١).

خست، موسعەب هەواڵی بەڕێکەوتنی(عبدالملك)ی پێگەیشت، سوپاکەی ڕێکخست و ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەری کردە پێشەنگی سوپاکە و لە (ئەجمیرا) بارگەی خست.[١]

ئینجا عبدالملك دەستی بە نامە ناردن کرد بۆ سەرۆکهۆزەکانی عێراقی نێو سوپاکەی موسعەب، بەڵێنی موژدەی خۆشی دەدانێ لە پلە و پایە و ماڵ و سامان.

ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری سەرکردەی پێشووی سوپاکانی موختاری سەقەفی و پێشەنگی ئێستای سوپاکەی موسعەبیش نامەیەکی لەلایەن (عبدالملك)ەوە بۆ هات، نامەکەی بە مۆرکراوی و نەکراوەیی هەڵگرت و دایە دەست موسعەب، موسعەب گوتی: چی تێدایە؟، گوتی: نەمخوێندۆتەوە، موسعەب خوێندیەوە، دەبینێ بانگی دەکا بۆ لای خۆی و بەڵێنی دەداتێ هەرێمی عێراق بە ئەو دەسپێرێ و دەیکا بە والی، (ئیبن لئەشتەر) گوتی: بەخوا عبدالملك ئەوەندەی لە من ناهومێدە لە کەسی تر هێندە هومێد بڕاو نیە، بزانە نامەی بۆ هەموو هاوەڵەکانت ناردووە، دەربارەی ئەو سەرۆکهۆزانە بە قسەم بکە، با لە ملی هەموویان بدەم، موسعەب گوتی: کەواتە دوای کوشتنیان هۆزەکانیان دڵسۆزیمان بۆ نانوێنن، (ئیبراهیم) گوتی: بە ئاسن دایان دەمرکێنم، بیاننێرە بۆ کاخی کیسرا و بەندیان بکە، لەجێی ئەوان وەکیل داینێ بەسەر هۆزەکانیانەوە، موسعەب گوتی: ئەی بابی نوعمان: من ئەو کارە ناکەم و لە دژی دەوەستمەوە، ڕەحمەتی خودا لە ئەبو بەحر ئەحنەفی کوڕی قەیس بێت: کە بەردەوام ئاگاداری دەکردمەوە لە غەدر و ناپاکی خەڵکی (عێراق)، هەر دەڵێی چاوی لەم بارودۆخە بوو کە ئێستا ئێمەی تێکەوتووین.[٢]

ئەمە بەنیسبەت خەڵکی عێراق سەیر نیە، تۆماری ئەوان پڕە لە غەدر و ناپاکی و هەڵوێست گۆڕین، بەڵکو عبدالمل) ڕایگەیاند: کە پێش ئەوەی نامەیان بۆ بنێرێ نامەی ئەوانی پێگەیشتووە،[٣]کار بەمە گەیشتبوو ئەم نامە گۆڕینەوەیە لە نهێنی دەرچوو بوو، کاتێك موسعەب بانگی موهەللەبی کوڕی ئەبی سەفرەی کرد تەگبیری

---

١ـ تأريخ الطبري(٧/٤٣).
٢ـ الكامل في التاريخ(٣/٥٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە(٣/٥٢).

پێ بکات (موهەللەب) گوتی: بزانە خەڵکی عێراق نامەیان بۆ عبدالملك ناردووە و ئەویش نامەی بۆ ناردوون، من لە خۆت دوور مەخەوە، موسعەب گوتی: خەڵکی (بەسرە) نایەن بۆ جەنگ تا تۆ نەنێرم بۆ جەنگی (خەواریج)، ئێستا (خەواریج) گەیشتوونەتە بازاڕی (ئەهواز)، من پێم ناخۆشە عبدالملك بەرەو من هاتبێت و بە گژیدا نەچمەوە، تۆ بڕۆ شکاندنی ئەم کۆسپە منی بەسە،[1] لەکاتی نامە و نامەکاری عبدالملك و عێراقیەکاندا، سەرانی سەرکردایەتی سوپاکەی موسعەب، سوپای موسعەبیان بەجێ دەهێشت و پەیوەندیان بە سوپاکەی (عبدالملك)ەوە دەکرد،[2] عبدالملك دوای بینینی بارودۆخەکە دەیەویست کێشەکە بەبێ شەڕ کۆتایی پێ بێنێ و دۆستایەتی و خۆشەویستیە کۆنەکەی نێوان خۆی و موسعەبی دەکردە پاساو، پیاوێکی هۆزی (کەلب)ی ناردە لای موسعەب و پێی گوت: سەلام لە خوارزاکەت بکە چونکە دایکی موسعەب (کەلبی) بوو، پێی بڵێ: با واز بێنێ لە بانگەشەکردنی خەڵك بۆ لای براکەی، منیش واز دێنم لە بانگەشە کردنی خەڵك بۆ لای خۆم، با کاروبار بە تەگبیر و ڕاوێژ بێت، موسعەب پێی گوت: بە عبدالملك بڵێ: شیر لە نێوانماندایە.[3]

ئینجا عبدالملك هەوڵێکی تری دا و محمدی کوڕی مەڕوانی برای ناردەلا، تا پێی بڵێ: ئامۆزاکەت ئەمانت دەداتێ، موسعەب گوتی: کەسێکی وەك من جگە لە هەڵوێستی سەرکەوتن و زاڵبوون یان شکان لە مەیدانی جەنگدا ئاوڕ لە هەڵوێستی تر ناداتەوە.[4]

ئینجا شەڕ دەستی پێکرد، ناپاکی و غەدر و خیانەتی خەڵکی عێراق دەرکەوت، موسعەب عوتابی کوڕی وەرقای بۆ هیمدادی ئیبڕاهیمی کوڕی ئەشتەر نارد، (عوتاب) لەو سەرۆك هۆزانە بوو نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ عبدالملك دا کردبوو، ئیبڕاهیم ئەمەی بە کارێکی خراپ دانا، گوتی: من پێم گوتی (عوتتاب) و هاو

---

١ـ الكامل في التاريخ (٣/٥١).
٢ـ تأريخ الطبري(٧/٤٤).
٣ـ الكامل في التأريخ(٣/٥٢).
٤ ـ تأريخ الطبري(٧/٤٥).

وێنەکانی بۆ من مەنێرە، (إنا لله و إنا إليه راجعون)، (عوتتاب) لەلای خۆی خەڵکی توشی شکان کرد، کاتێك تێکشکا (ئیبن لئەشتەر) ئارامی گرت و لە مەیداندا مایەوە تا کوژرا،[1] بە کوژرانی (ئیبن لئەشتەر) زیانی گەورە لەموسعەب کەوت، چونکە سەرەڕای ئازایەتیەکەی، دڵسۆزێکی نزیکی ئەو بوو، لەبەر ئەوە کاتێك شەڕ لە قوڵی موسعەب گەرم ببوو و کەوتبووە تەنگانەوە، هاواری کرد: هۆێ ئیبراهیم! ئیمڕۆ ئیبراهیمم نیە![2] خەڵکی عێراق موسعەبیان بەجێهێشت و تووشی شکانیان کرد، کار بەوە گەیشت جگە لە (٧) کەس، کەسی تری بە دەورەوە نەما،[3] بەڵام بەردەوام پاڵەوانانە دەجەنگا، لە خوێندا شەلاڵ ببوو، پاشان زیادی کوڕی توبیان لەسەر کۆشکی (دوجەیل)ی دێری (جاثلیق) و لە مەیدانی جەنگدا کوشتی،[4] لە جەمادی دووەمی ساڵی٧٢ی کۆچیدا، کە ئەم هەواڵە گەیشتە عبدالملك، ئەو گوتی: بینێژن، بەخودا حورمەتی نێوانمان کۆنینەیە، بەڵام دەسەڵات نەزۆکەو بەرهەمی خێری‌نیە.[5]

بە کوژرانی موسعەب جەنگ کۆتایی هات، عبدالملك چووە نێو (کوفە)وە، دانیشتوان بەیعەتیان پێدا، عێراق هاتەوە نێو باوەشی دەوڵەتی ئومەوی، عبدالملك بیشری کوڕی مەڕوانی برای کردە والی، پێش ئەمە (عێراق) بەجێ بێڵێ سوپایەکی ئامادە کرد بۆ پەلاماری سەر (مکە)و کۆتایی هێنان بە ئیبن زوبێر.

**١ ــ هۆیەکانی تێکشکانی موسعەبی کوڕی زوبێر:**

هۆی زۆر پشکیان هەبوو لە شکانی (ئیبن زوبێر) لە عێراقدا، لەنێو ئەو هۆیانەدا:

أ ــ بەشدار نەبوونی موهەللەبی کوڕی ئەبی سەفرە بە خۆی و سەربازانیەوە، ئەو جەنگاوەرێکی بە جەرگ و شارەزای کاروبارەکانی جەنگ بوو، موسعەب لەسەر حەزی خەڵکی (بەسرە) بۆ جەنگی (خەواریج)ی نارد، لە کاتێکدا (موهەللەب)

---

١ـ الكامل في التاريخ(٣/٥٣).
٢ـ تأريخ الطبري(٧/٤٥).
٣ـ الكامل في التاريخ(٣/٥٤،٥٣).
٤ـ تأريخ الطبري(٧/٤٤).
٥ـ هەمان سەرچاوە.

بەموسعەبی گوتبوو: لەخۆتم دوور مەخەوە،[1] ئەگەر موسعەب (موهەللەبی) لە خۆی دوور نەخستبایەوە: سوودی زۆری لە سوپاکەی و توانا و شارەزایی یەکەی وەردەگرت.

ب ـ غەدر و خیانەتی سەرۆکهۆزەکانی عێراقی نێو سوپاکەی موسعەب، ئەم غەدر و خیانەتە بەهۆی: بەڵێن و موژدەکانی عبدالملك و نەبوونی توانای سرنج ڕاکێشانیان لەلایەن موسعەبەوە سەری هەڵدا.

ج ـ مەست نەکرانی سەران و پیاوماقوڵانی عێراق بە بەخشیش و ماڵ و سامان لەلایەن (عبدالله ی کوڕی زوبێر) ی خەلیفە وە، ئەم سەرۆکهۆزانە لەگەڵ موسعەبدا هاتنە (مكة) بەڵام عبدالله هیچی نەدانێ.

د ـ تووڕە بوونی خەڵکانی شیعە بە کوژرانی موختار لەلایەن موسعەبەوە، شیعە پێی وابوو موختار تۆڵەی لە بکوژانی حوسێن کردۆتەوە و هەموویانی کوشتووە: بۆیە کاتێك موسعەب پێکرا، زائیدەی کوڕی عودامە ئەم دەستەواژەیەی دەربڕی: (یالثارات المختار) واتە: هاوار بۆ تۆڵە سێنانی موختار!.

هـ ـ شارەزا نەبوونی موسعەب لە بواری نەخشەی سەربازی یەوە، هەرچەند دوژمنەکانیشی دانیان بە ئازایەتی و پاڵەوانێتی و خۆڕاگری و نەبەزی ئەودا دێنا.

و ـ ماندوو بوون و شپرزە بوونی سوپای زوبێریان، چونکە ژمارەیەك جەنگیان لەنێو عێراقدا ئەنجامدابوو، بەڵام سوپای ئومەویان حەساوە بوو، کاتێك سوپاکەی عبدالملك یان بینی پاڵیان دایەوە و ترس دایگرتن.[2]

هـ ـ نەناردنی هێزی سەربازی بۆ عێراق لەلایەن عبدالله ی کوڕی زوبێرەوە. جێگای خۆی بوو عبدالله بە هەموو توانایەکیەوە بە هاواری موسعەبەوە چووبایە، چونکە لەدەستدانی (عێراق) واتە لەدەستدانی سەرچاوەکانی داهات و سەرتایەکیشە بۆ ڕووخانی سیاسی.[3]

---

١ـ الكامل في التاريخ(٣/٥١).
٢ـ تحديد الدولة الاموية، للناطور ص:٨٠.
٣ـ هەمان سەرچاوە.

**٢ ــ کاریگەری کوژرانی موسعەب لەسەر عبدالله ی کوڕی زوبێر و وتارەکەی:**

عبدالله ی کوڕی زوبێر کاتێك هەواڵی کوژرانی موسعەبی برای پێگەیشت، هەستایە سەر پێو وتارێکی خوێندەوە و گوتی: سوپاس بۆ (ألله) کە دروستکردن و فەرماندان هەمووی هی خۆیەتی، بە ویستی خۆی دەسەڵات دەبەخشێ بە هەر کەسێك بیەوێ، دەسەڵات دەسێنێتەوە لە هەر کەسێك بیەوێ، ویستی لەسەر کێ بێ دەسەڵاتداری دەکات، ویستی لەسەر کێ بێ داماوی دەکات، بەڵام: کەسێك خاوەن هەق بێ داماوی ناکا، با بە تەنیاش بێ و کەسی لەگەڵ نەبێت، خودا کەسێك عەزیز و سەربەرز ناکات سەرپەرشتیارەکەی شەیتان و حیزبی شەیتان بێ. با هەموو خەڵکیشی لەگەڵ بێت ، ئاگاداربن: هەواڵێکمان لە عێراقەوە پێگەیشتووە، دڵتەنگمان دەکات و دڵخۆشیشمان دەکات، هەواڵی کوژرانی موسعەبمان پێگەیشتووە، خودا ڕەحمی پێ بکات،ئەوەی دڵخۆشمان دەکات کە دەزانین کوژرانەکەی شەهادەتە بۆ خۆی، ئەوەی دڵتەنگمان دەکات: لەدەستدانی خۆشەویست جەرگسوتانە و خۆشەویستەکەی لە کاتی موسیبەتەکەدا ئازاری هەیە، دوای ئەمە خاوەن ڕایان ئاوڕ بۆ ئارامگرتنی جوان و تازیەباری ڕێزدارانە دەدەنەوە، ئەگەر ئیمڕۆ موسیبەتی موسعەب هاتووە بەسەرمدا، پێش ئەمەش بە (زوبێر) تاقی کراومەوە، کارەساتی عوسمانیش موسیبەتێکی مەزن بوو، موسعەب تەنها بەندەیەك بوو لە بەندە بچوکەکانی خودا و پشتیوانێك بوو لە پشتیوانەکانم، بەڵام خەڵکی عێراق خەڵکی غەدر و نیفاق داویانە بە دەستەوە و بە کەمترین نرخ فرۆشتوویانە و بە کوشتیان داوە، بەخودا ئێمەی ئالی زوبێر وەك ڕۆڵەکانی (عاص) لە شوێنی پاڵدانەوەمان نامرین، بەخودا کەسێك لە ئالی زوبێر نە لەسەردەمی جاهیلی، نە لە سەردەمی ئیسلامدا لە هەڵاتندا و لە پشتەوەڕا نەکوژراوە، مردنی ئێمە مردنی دەستە و یەخە و خێرایە، چ بە تیر بێ چ بە شیر بێ، ئاگادار بن: دنیا موڵکی لەنێوچووە و بەس موڵکی خودا لەنێو ناچێت و دەسەڵاتی ڕەها هی ئەوە، ئەگەر دنیا بەرەو لام بێت وەك خۆبەزلگری شەڕانی پێشوازی لێناکەم، باوەشی پێدا ناکەم، ئەگەر پشتم تێ بکات و وەك ئەو کەسەی بسوتاوە و سوکوچروکە بۆی

ناگريەم، ئەم قسەم كرد و لە خودا دەخوازم چاوپۆشى لە منيش و ئێوەش بكات.[١]

**٣ ـ هەڵوێستى عبدالملك سەبارەت بە كوژرانى موسعەبى كورِى زوبێر:**

كاتێك سەرى براوى موسعەبى كورِى زوبێر يان لەبەردەستى عبدالملك دانا، گرياو گوتى:كاتى خۆى ساتێك بەبێ هاوەلايەتى ئەو خۆشەويسەم مەدارم نەدەكرد، تا شير كەوتە نێوانمانەوە، بەلام دەسەلات نەزۆك و بێ وەفايە.[٢]

عبدالملك تا نەگەيشتە سەر كورسى دەسەلات، باسى دۆستايەتى نێوان خۆى و موسعەبى فەرامۆش كردبوو، پاش ئەمە لە هەموو كۆروكۆبوونەوەكانيدا باسى رەوشت و كردەوە جوانەكانى موسعەبى دەكرد، دەيزانى دواى نەمانى ئەم باسانە زيان بە دەسەلاتەكەى ناگەيەنن.[٣](ابن كثير) دەگێرِێتەوە: رۆژێك عبدالملك بە دانيشتوانى كۆرِەكەى گوت: كێ ئازاى عەرەبە؟ گوتيان: (شەبيب، قوترِى كورِى فوجائە، فلان، فلان،...هتد) عبدالملك گوتى: ئازايەتى هى كەسێكە كە چەقى بەستووە لە نێوان سەكينەى كچى حوسێن و عائيشەى كچى تەلحە و دايكى حەميدەى كچى عبدالله ى كورِى عامرى كورِى كريزە، دايكى: رەبابى كچى ئەنەفى كەلبى يە، گەورەى ضاحيةى عەرەبە، والى عێراق بووە لە ماوەى (٥) سالى تەواودا، هەزارانى هەنگاوتووە، ئەمانى پێدرا بەلام رەتى كردەوە، بە شيرەكەى هاتە مەيدانەوە و هەداى نەدا تا نەكوژرا، ئەو كەسە موسعەبى كورِى زوبێرە، كەسێكى بێ فێلێ بوو و فێرى ئەمبەرەوبەر نەبوو.[٤]

پێدا هەلگوتنى عبدالملك بە بەژن و بالاى موسعەبدا، لەمرۆدا تۆزقالێك زيان بەدەسەلاتى ناگەيەنێ، ئەو بۆلاى پەروەردگارى گەرِايەوەو هەموو دنياى بە زەرِق و بەرِق و پاتالەكەيەوە بۆ بەجێهێشت، دواى ئەوەى موسعەب مەترسى بۆ دەسەلاتى عبدالملك دروست ناكات، قەيدى نيە باسى چاكەكانى بكات و بەرۆشى خۆى بۆ

---

١ـ تأريخ الطبري(٥٣/٧).
٢ ـ هەمان سەرچاوە (٤٧/٧).
٣ ـ الأمويون(٣٨٠/١).
٤ـ البداية و النهاية(١٥٢/١١).

دەربڕیێ، لەبەر ئەمە کاتێك سەری موسعەبیان هێنایە بەردەم، عبدالملك گوتی: بینێژن، سوێند بە خودا: حورمەت و ڕێزی نێوانمان دێرینە، بەڵام دەسەڵات بێ وەفایە، فەرمانیدا موسعەب و عیسى ی کوڕی موسعەب بنێژن.[1]

**٤ ـ لاواندنەوەی موسعەب لەلایەن شاعیرانەوە:**

عبیدالله ی کوڕی قەیسی ڕوقییات یەکەمین شاعیری بزوتنەوەی (ئیبن زوبێر) و بەرگریکاری بەشێك لەو لاوەندنانەی کە موسعەب دا هەڵی گوتوون:

نعت السحائبُ و الغمام بأسرها      جسداً بمسكن عاري الأوصال
تُمسي عوائده السباعُ وداره      بمنازل أطلالهن بوالي
رحل الرفاق و غادروه ثاوياً      للريح بين صبا و شمال.[2]

**٥ ـ( سەکینەی کچی حوسێن )ی هاوسەری موسعەب:**

موسعەب چەند شەوێك بەر لە دەرچوونی لە کوفە ئەم چەند دێڕە شیعرەی بۆ سەکینەی کچی حوسێنی هاوسەری نووسیبوو:

و كان عزيزاً أن أبيت و بيننا      حجاب فقد أصبحت مني على
و أبكاها للعين والله فاعلمي      إذا ازددت مثليها فصرت على
و أبكى لقلبى منهما أننى      أخاف بألا نلتقي آخر الدهر

دەڵێن: موسعەب لە ڕۆژی تێدا کوژرانیدا چۆتە لای (سەکینە)، پۆشاکەکەی دادەنێ و ملبەندێك لەبەر دەکات و بە ملپێچێك دایدەپۆشێ، شیرەکەی بە دەستەوە دەگرێت، لێرەدا (سەکینە) زانی کە بەتەمای گەڕانەوە نیە، بۆیە هاواری کرد و گوتی: ئەی هاوار موسعەب چەند خەمبارم!. ئەویش ئاوڕی لێدایەوە سەکینە

[1] ـ تأريخ الطبري، الأمويون، للوكيل(١/٣٨١).
[2] ـ البداية و النهاية(١١/٦٥٦).

هەموو ناو دڵی خۆی بۆ هەڵنەڕشتبوو و شتی لێ دەشاردەوە، موسعەب گوتی: هەر ئەوەندەت لە دڵدایە بۆ من؟ گوتی: ئەو خۆشەویستیەی لێم شاردوویەوە زۆر زۆرترە! موسعەب گوتی: ئەگەر پێشدا ئاوام دەزانی حاڵی من و تۆ جۆرێکی تر دەبوو، ئینجا دەرچوو و نەگەڕایەوە و کوژرا، (سەکینە) چووە نێو تەرمەکان و بە خاڵەکەی سەر ڕوومەتی ناسیەوە، سەری بەسەر سەریدا شۆڕکردەوە و گوتی: ڕەحمەتی خوات بەسەردا بڕژێ وەڵڵاهی چاکترین دۆستی گیانی بە گیانی منی (موسلیمە) بووی، چاك لە عەنتورە دەگەم کە دەڵێ:

و خليل غانية تركت منجدلاً — بالقاع لم يعهد و لم يتكلم
مهتكت بالريح الطويل إهابة — ليس الكريم على لقنا بمحرم[1]

سەکینە خودی خۆی ئاوا موسعەبی لاواندۆتەوە:

فإن تقتلوه الماجد الذي — يرى الموت إلا بالسيوف حراماً
و قبلك ماخاض الحسين منية — إلى القوم حتى أوردوه حماماً.[2]

١ ـ المنتظم لإبن الجوزي(٦/١١٤،١١٥).
٢ ـ موقف الشعر من الحركة الزبيرية، ص:٦٠.

## باسی چوارەم: کۆتایی هاتنی ئەمیری ئیمانداران عبداللە ی کوڕی زوبێر رضي الله عنهما:

## یەکەم: هەوڵەکانی دەوڵەتی ئومەوی بۆ زەوتکردنی (حیجاز) پێش دوایەمین گەمارۆدانی (ئیبن زوبێر).

ورده شەڕ و پەلاماردانی نێوان (ئیبن زوبێر)و عبداللە لە بەرەی حیجازدا درێژەیان هەبووە لە گرنگترین پەلاماری هەردوولا بۆسەر یەکتری ئەمانە بوون:

### ١ ـ هێرشی حوبەیشی کوڕی دەلجەی قینی:

خەریکە هەموو گێڕانەوەکان کۆك بن لەسەر ئەوە کە (مەڕوانی کوڕی حەکەم) دوای هاتنەوەی لە(میسر) ئەم هێزە پەلاماردەرەی ناردبێتە سەر حیجاز.[١]
وەك دەردەکەوێ ئەم پەلامارە لەدواساتەکانی سەردەمی مەڕواندا ئەنجامدرابێ و پێش ئەوەی هیچ ئامانجێك ئامانجێك بپێکی مەڕوان مردووە، ئەمە وای لەمێژوو نووسانێك کردووە بنووسن: عبدالملك ئەم هێرشەی بەرێکردووە،[٢] ژمارەی هێزەکە لە نێوان ٦٤٠٠ـ٧٠٠٠ جەنگاوەردا بووە.[٣]

(ئیبن زوبێر ) توانی بەسەر ئەم سوپایەدا زاڵ بێ، (حاریسی کوڕی ڕەبیعە)ی والی بەسرە سوپایەکی بە سەرکردایەتی (ئیبن دەلجە ) کردەوە، (ئیبن زوبێر)یش لە قۆڵی خۆیەوە سوپایەکی تری بەسەرکردایەتی (عەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ئەنساری) بەرێکرد، تا لەگەڵ سوپاکەی (حەنتف) یەکبگرن و کۆتایی بە سوپاکەی (حوبەیش) بێنن، ئەم بەرەنگاربونەوەیە بە سەرکەوتوویی ئەنجامدرا[٤] لە ڕەبزە.[٥]

---

١ـ تاريخ الطبري، نقلا عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨١.
٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨١.
٣ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨١.
٤ـ تاريخ الطبري (٥٥٣/٦).
٥ ـ أنساب الاشراف (١٥١/٥ ـ١٥٣).

٢ ــ هێرشی نائیلی كوڕی قەیسی جوزامی:

دوای مردنی حەنتفی كوڕی سەجەف لە (وادي القرى)، (ئیبن زوبێر ) فەرمانی بە (نائیل) كرد بپەڕێتەوە سەر سنوورەكانی (شام) و ڕوانگەیەكی سەربازی تێدا دابمەزرێنێ،[1] لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە (ئیبن زوبێر) دوای مردنی مەڕوان (نائیلی)ی بەڕێكردو فەرمانی پێكرد بچێ بۆ فەلەستین،[2] هەرچۆنێك بێت هەردوك ڕیوایەتەكە ڕێكن لەسەر ئەوە كە عبدالملك ی كوڕی مەڕوان توانی لە (ئەجنادین) كۆتایی بە نائیلی كوڕی قەیس بێنێ، بەم شێوەیە (نائیل)و هاوەڵانی لە ساڵی ٦٦ی كۆچی لە وڵاتی (فەلەستین) كوژران.

٣ ــ هێرشی عوروەی كوڕی عەنیف:

عبدالملك عوروەی كوڕی ئەنیفی بە (٦) هەزار جەنگاوەرە وە بەرەو (مەدینە) بەڕێكرد، فەرمانی پێكرد لای كەس بە میوانی دانەبەزن، بۆ پێویستیەكی زۆر ناچار نەبێت نەچنە نێو (مەدینە)وە، لە(عرصة گۆڕپانی شار) سەربازگە دروست بكەن، (عوروە) بەڕێكەوت و لە (عرصة) هەڵیدا، بەپێی ئامارەی گێڕانەوەكە، دەبێ حاریسی كوڕی حاتەبی كاربەڕێوەبەری (مەدینە) هەڵاتبێ: چونكە(عوروە) ڕۆژانی هەینی دەچووە نێو (مەدینە)وە و (جمعە)ی بەخەڵك دەكرد، پاشان دەگەڕایەوە نێو سەربازگە، (عوروە) ماوەی مانگێك بەم شێوەیە مایەوە، (ئیبن زوبێر) كەسی بۆلا نەنارد، هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەكیش لە نێوان سوپای (عوروە)و سوپای (ئیبن زوبێر) ڕووی نەدا، عبدالملك فەرمانیدا ئەم سوپایە بگەڕێتەوە شام، ئەویش گەڕایەوە،[3]

٤ ــ هێرشی ( عبدالملك ی كوڕی حاریسی كوڕی حەكەم ):

عبدالملك ی كوڕی مەڕوان ئەم هێزەی بەرەو(مدینە) بەڕێكرد، ژمارەی (٤) هەزار

---

١ـ هەمان سەرچاوە (١٥٨/٥).
٢ـ هەمان سەرچاوە (١٥٩/٥).
٣ ـ الطبقات، نقلا عن عبدالله بن الزبیر، للخراشي ص ١٨٥.

جەنگاوەر بوو، کاری پاراستنی ناوچەکانی نێوان مەدینەو شام بوو.عبدالملکی کوڕی حاریس هێزەکەی لە (وادي القرى) جێگیرکرد، لەوێڕا هێزێکی (٥٠٠) نەفەری بەسەرکردایەتی (ئەبو قەمام) ناردە سەر (خەیبەر و فەدەك) کە سلێمانی کوڕی خالید بەڕێوبەرایەتی دەکردن، (سلێمان) هەوڵی دەربازبوونی دا، بەڵام لەلایەن ئەم هێزە پەلاماردەرەوە گیراو کوژرا،[١] (ئیبن زوبێر) نەیدەتوانی بەر بە پەلامارەکان بگرێت، (حاریسی کوڕی خەتتاب)ی لە پۆستەکەی لابرد و (جابری کوڕی ئەسوەد)ی لە جێگە دانا، (جابر) لە قۆڵی خۆیەوە هێزێی هێرشبەری بەسەرکردایەتی ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقەیس ناردە سەر (ئەبوقەمام) لە (خەیبەر)، لە ئەنجامدا (ئەبوقەمام) و هێزەکەی تێکشکاند.[٢]

٥ ــ هێرشی (تاریقی کوڕی عومەر):

ئەمە دواهەمین هێرش بوو لەلایەن (عبدالملکی کوڕی مەڕوان)ەوە بەرەو(حیجاز) بەڕێکرا، ئامانج لەم هێرشە: زەوتکردنی ناوچەکانی (ئەیلە)و (وادي القرى) و بە هاوارەوەچوونی کاربەدەستەکانی عبدالملك لە کاتی پێویستدا بوو، لە هەمان کاتیشدا دەبێتە بەربەستێك لەبەرامبەر جموجۆڵەکانی(ئیبن زوبێر)، والی بەسرە لەسەر فەرمانی (ئیبن زوبێر) هێزێکی (٢) هەزار کەسی بە سەرکردایەتی (ئیبن ئۆراس) بۆ پارێزگاری کردنی(مەدینە) نارد، ئەم هێزە بە ڕێکوپێکی ئەرکەکەی خۆی ڕادەپەڕاند، بەڵام هێندەی نەبرد (ئیبن زوبێر) فەرمانی بە (ئیبن ئۆراس) کرد بەرەنگاری (طارقی کوڕی عومەر) ببێتەوە، دەرەنجامی تێك هەڵچوونەکە سەرکەوتنی (طارقی کوڕی عومەر) بوو، تاریق بۆ (وادي القرى) گەڕایەوە و خۆی بەو کارەوە خەریك کرد کە لە لایەن (عبدالملك)ەوە پێی سپێردرابوو.[٣]

١ ـ الطبقات، نقلا عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨٥.
٢ ـ الطبقات، نقلا عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨٦.
٣ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨٧.

## دووەم: گەمارۆی دووەم و ڕووخانی خیلافەتی ئیبن زوبێر:

سەرکەوتنی عبدالملك بەسەر موسعەب لە جەنگی (دتیری جاسلیق) زەنگی ئاگاداری بوو بۆ کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکەی (عبدالله ی کوڕی زوبێر)، کە ئەو کاتە لە هەموو هەرێمەکاندا کاروباری بۆ چەسپابوو، دەوڵەتی ئیبن زوبێر لە هەرێمی (حیجازدا) گەمارۆ درا، چونکە لە بواری دوو هێزی دارایی و سەربازی هەژار بوو نەیدەتوانی زۆر خۆی ڕابگرێت، هەروەك خودی عبدالله بە لەدەستدانی موسعەبی برای ئەژنۆی شکان و تووشی خامۆشی بوو، بەڵام ئاڵاکەی فڕێ نەدا، تا دوا هەناسەی ژیانی لە سەنگەری بەرگریدا بوو.

عبدالملك دوای زاڵبوونی بەسەر موسعەبدا کاتی بەفیڕۆ نەدا و بڕیاری دا بە تەواوەتی کۆتایی بە دەوڵەتی (ئیبن زوبێر) بێنێ،[1] سوپایەکی گەورەی ساز کرد و حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کردە سەرکردەی، حەجاج بەسوپاکەیەوە بەرەو (حیجاز) بەڕێکەوت، لە (طائف) جێگیر بوو، لەوێڕا مەفرەزەی سەربازی دەناردنە سەر (مەککە)، (ئیبن زوبێر)یش بە وێنەی ئەو مەفرەزەی سەربازی دەنارده سەر ئەو شەڕیان دەکرد و دەگەڕانەوە سەربازگەکانیان.[2]

عبدالملك فەرمانی بە تاریقی کوڕی عومر کرد (وادي القرى) بەجێ بێڵێ و لەگەڵ سوپاکەی حەجاج بکەوێ، تاریق بە خۆی و (٥) هەزار جەنگاوەرەوە خۆی گەیاندە حەجاج.[3]

### ١ ــ گەمارۆی ئابووری:

حەجاج بە ئامانجی زیاتر تەنگ پێهەڵچنینی (ئیبن زوبێر) گەمارۆی ئابووری لەسەر (مەککە) دانا.

---

١ ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي، ص ٥٠٣.

٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨٩.

٣ـ الطبقات، نقلا عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٨٩.

ئیبن حزم دەگێڕێتەوە: عبدالملك بەشداری بڕیاری گەمارۆدانی ئابووری سەر (مەککە)ی کردووە و، کاری ڕێگرتن بە گەیشتنی خۆراك و دانەوێڵە بە (مەککە)ی بە (خالیدی کوڕی ڕەبیعە) سپاردووە.[١]

ئەم گەمارۆیە کاریگەری لەسەر (ئیبن زوبێر) دروست کرد و خەڵکی تووشی برسێتیەکی بێڕەزا بوون، کار بەوە گەیشت (ئیبن زوبێر) ناچار بوو ئەسپەکەی خۆی بکوژێتەوە و دەرخواردی هاوەڵەکانی بدا.[٢] لە هەمان کاتدا عبدالملك ئارد و ئازوخە و نان و کێك و خواردەمەنی جۆرا و جۆری دەناردە دەوری مەکە و بەسەر خەڵکی شامدا دابەش دەکرا،[٣] ئەمە وایکرد بارودۆخی نێو (مەککە) بگۆڕێت ز بوزین لە نێو پشتیوانانی (ئیبن زوبێر) دروست ببێت، ئەوەبوو یەك لە دوای یەك دەورەی عبدالله یان چۆڵ کرد، هاندەری زیاتری ئەم بەزین و ڕوخانە ئەوە بوو: حەجاج ئەمانی دەدا بە هەر کەسێك واز لە شەڕ بێنێت و لە لە ئیبن زوبێر بکشێتەوە.[٤]

**٢ ــ دانانی مە نجەنیق لەسەر چیاکانی (مەککە):**

حەجاج ویستی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی (ئیبن زوبێر) بە دەستی ئەو بێت، بۆیە نامەیەکی بۆ عبدالملك نووسی، تا ڕێگەی بدا شەڕی لەگەڵ بکات و بەرەنگاری بێتەوە، عبدالملك وەڵامی دایەوە گوتی: ڕات لەسەر چیە ئاوا بکە،[٥]کاکڵەی وەڵامەکە ڕەزامەندی بوو لەسەر داواکەی حەجاج، کە دەیەویست خۆی بڕکێش بکات و پەلاماری (مەککە) و عبدالله بدات، ئینجا حەجاج بە سوپاکەیەوە بەرەو (مەککە) بەڕێکەوت، مەنجەنیقی لەسەر چیاکان دامەزراندن، ئینجا بەبێ پسانەوە بەردبارانی (ئیبن زوبێر)ی کرد لە نێو حەرەمدا، سوپاکەشی لەگەڵ جەنگاوەرانی (مەکە) دەستە و بەخە ببۆوە،[٦] ژمارەیەك لە پیاوماقوڵانی (مەککە) کە لە

---

١ـ جمهرة انساب العرب ص ٢٤٤.
٢ـ انساب الاشراف (٣٦١/٥)، عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٩٠.
٣ ـ انساب الاشراف (٣٦٠/٥).
٤ ـ هەمان سەرچاوە (١٦٦/٥)، عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٩٠.
٥ ـ انساب الاشراف (٣٥٨/٥).
٦ ـ هەمان سەرچاوە.

سەروویانەوە ئیبن عومەر دەبینرا كەوتنە نێوبژیوانی، داوایان لە حەجاج كرد واز لە بەكارهێنانی (مەنجەنیق) بێنێ، وەلامی دانەوە و گوتی: بە خوا منیش وەك ئێوە ئەمەم پێ ناخۆشە، بەلام چ بكەم! ئەو پەنای بۆ بەیت بردووە؟!

حاجیانی ئەو ساڵە لە تێكڕای وڵاتانی جیهانی ئیسلامیەوە گەیشتنە نێو (مەككە)، بە هۆی بەردبارانی مەنجەنیقەوە نەیانتوانی تەوافی قدوم بكەن، بەمە یەك لە ڕوكنەكانی (حەج)بەكی دەخرا، بۆیە (ئیبن عومەر) خۆی لە مەسەلەكە هەڵقورتاند و نامەیەكی بۆ حەجاج نووسی و گوتبووی: (لە خوا بترسە، تۆ ئێستا لە مانگی حەرام و شاری حەرام دای، وا میوانانی خوا لەم سەروسەری سەر زەمینەوە هاتوون فەرزێك لە فەرزەكانی خوا ڕاپەڕێنن و خێر و بێری خۆیان زیاد بكەن).[١]
حەجاج فەرمانی بەتاریقی كوڕی عومەر كرد: لە ئێستاڕا تاكۆتایی (حەج) كار بەمەنجەنیقەكان ناكەن، بە وەفدەكەی مەككەی گووت: منیش وەكو ئێوە ئەمەم پێ ناخۆشە، بەلام (ئیبن زوبێر) پەنای بۆ (بیت) بردووە،[٢] هەرچۆنێك بوو مەنجەنیقەكانی ڕاگرتن تا خەڵك لە تەواف كرد تەواو بوون.[٣]

دوای دیمایی هاتنی وەرزی (حەج)، حەجاج بانگی حاجیانی كرد ئینجا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەكانیان، چونكە شەڕ لە دژی (ئیبن زوبێر) دەست پێ دەكرێتەوە.[٤]

بلاذري دەگێڕێتەوە ژمارەیەك لە هاوەڵانی هەوڵیان دا قەناعەت بە (ئیبن زوبێر) بكەن كەڵك لە ئەمانی حەجاج وەربگرێت، بەلام ئەو وەلامی نەدانەوە و سوور بوو لەسەر مانەوە لە نێو سەنگەری بەرگریدا، مێژوونووسان چەند هەڵوێستێكی جوامێرانەی ئیبن زوبێریان بۆ خستووینەتە سەر كاغەز لە كاتێكدا بەرەنگاری مەفرەزەكانی حەجاج بۆتەوە، بەزین و دۆڕانی خەڵكانی دەوروبەری گۆڕانی بەسەردا نەهێنا و شل نەبوو و سڵ نەبوو، تا دوا هەناسە لە سەقامگیری لەسەر ئەو

---

١ـ انساب الاشراف (٥/٣٧٦)، الحجاج بن يوسف المفترى عليه ص ٥٣.
٢ـ المنتقى في اخبار ام القرى ص ٢٦، الحجاج بن يوسف المفترى عليه ص ٥٣.
٣ـ الحجاج بن يوسف المفترى عليه ص ٥٤.
٤ـ انساب الاشراف (٥/٣٧٦)، الحجاج بن يوسف المفترى عليه ص ٥٤.

بیروڕایە مایەوە کە لە پێناویدا دەجەنگا.[١]

**٣ ـ ئەسمائەی کچی صدیق: نەخشەی ڕێبازی ئازادیخوازان بۆ کوڕەکەی دەکێشێت:**

دوای هاتنی زەرزی (حەج)، حەجاج جاڕیدا لە نێو حاجیاندا: بەرەو وڵاتەکانتان بڕۆنەوە: چونکە دەست بە بەردبارانی (بیت) دەکاتەوە.[٢]

دەستی بە لێدانی (کەعبە) کردەوە، (ئیبن زوبێر) کەوتە تەنگانەوە، زۆرینەی هاوەڵانی دەورەیان چۆلکرد، لە نێوانیاندا (هەمزە و خوبەیب)ی کوڕی دەبینران، داوایان لە حەجاج کرد ئەمانیان بدات.[٣]

کاتێك (ئیبن زوبێر) ئەم وەزعەی بینی چووە لای (ئەسمائە)ی دایکی و پێی گوت: خەڵك بە دوو کوڕەکەی خۆشمەوە بەجێیان هێشتم و شکاندیانم، جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت، کە ئەوانیش هەر ماوەیەکی تر بڕ دەکەن، کەسم بە دەورەوە نەماوە، ئەو خێڵەی بەنی ئومەییە چ شتێك بخوازم لە دونیادا دەمدەنێ، ڕات چیە و چۆنە؟

ئەسماء گوتی: بە خوا تۆ چاکتر شارەزای بە ناخی خۆت، گەر دەزانی لەسەر هەقی و بۆ هەقیش بانگەواز دەکەی هەر لەسەر ئەوە بڕۆ، خۆ هاوەڵە دڵسۆزەکانت کوژران، تۆش سەرت شۆڕ مەکە و ملت درێژ مەکە بە گەپجاڕی دەستی منداڵانی (بەنی ئومەییە)! ئەگەر دەزانی بۆ دونیاشت کردووە، ئەوا خراپترین بەندە ئەتۆی، خۆت لە نێو برد، هاوەڵانت لە نێو بردن، ئەگەر دەشڵێی: من لەسەر هەقم، بەڵام هاوەڵەکانم بەزین و منیش لاواز و دەستەوپاچە بووم، ئەمەش کاری مرۆڤی ئازا و دیندار نیە، چەندەت ماوە ماوە لە دونیادا؟!، کوژران لە مردنی سەرشۆڕانە باشترە! (ئیبن زوبێر) لە دایکی نزیك بۆوە و سەری ماچ کرد و گوتی: بە خوا ئەمەی گوتت ڕای منیشە، تا ئیمڕۆ بانگەشەم بۆ هەق کردووە و تۆزقاڵێك باڵم لە دنیا نەداوە، پێشم خۆش نەبووە تێیدا بژیم، جگە لە تووڕەبوون لەبەر خودا و

---

١ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي ص ١٩١.
٢ـ الكامل في التاريخ (٣/٦٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە (٣/٧٠).

حەڵاڵ کرانی حەرامەکانی شتێکی تر منی هانِ نەداوە بۆ دەرچوونم، بەڵام تەنها پێم خۆش بوو لە ڕای تۆ دڵنیا بم، ڕۆشنایی زیاترت بە بیناییم بەخشی، دایە: تەماشاکە، من لەم ڕۆژەدا دەکوژرێم، دڵی خۆت تەنگ مەکە و کاری خۆت بە خودا بسپێرە، دڵنیا بە کوڕەکەت خراپەیەکی نەکردووە، کاری پیسی ئەنجام نەداوە، لە حوکمی خودادا ستەمی نەکردووە، هەواڵی ستەمی هەر کاربەدەستێکی خۆمم پێ گەیشتبێت، ڕازی نەبووم و دژی وەستاومەتەوە، هیچ شتێکم بەسەر ڕەزامەندی پەروەردگارم هەڵنەبژاردووە، خودایە: ئەم قسانە بە مەبەستی خۆ بە پاکدانان ناکەم، تۆ شارەزاتری بە خۆم، ئەم قسانە دەکەم: تا تازیە و سەرەخۆشی لە دایکم بکەم و سەبووری و تەسەللاتی بێ و تۆخژنی بەسەر دڵدا بێ.

دایکی گوتی: ئومێدەوارم، کە پێشم کەوتی خودا دڵ و دەروونم ئارام بکات و تۆخژنی بداتێ،، لە ئاقار لەدەستدانی تۆدا، ئەگەر پێشیشت کەوتم دەربارەی خۆم ئارامم بکات، بڕۆ دەرەوە، تا ببینم ئەنجامی کارت بۆ کوێ دەگات.

ـ عبدالله گوتی: دایە: خودا پاداشتی خێرت بداتەوە، لە پێش کوژرانم دا و لە دوای کوژرانم دا بۆم لە خوا بپاڕێوە.

گوتی: هەرگیز دەستبەرداری پاڕانەوە نابم.ئینجا گوتی: کەسانێك هەن لەسەر ناهەق دەکوژرێن و کوژراون، تۆ لەسەر هەق دەکوژرێی، گوتی: خودایە: بە بەزەیی بە لەگەڵی، بە درێژایی شەوان هەستاوە و بۆ عیبادەت ڕاوەستاوە، لە نێو دۆڵ و شیوە چۆڵەکانی مەککە و مەدینە بە زاری بەڕۆژوەوە لە ترسی تۆ کوڵی هەستاوە و گریاوە، بەرامبەر بە من و بابی چاکەکار بووە، خودایە: بە تۆم سپارد و دامە دەست تۆ، ڕازیم بە بڕیارت، لەهەمبەر لە دەستدانی عبدالله دا پاداشتی ئارامگران و سوپاسگوزارانم پێ ببەخشە![1]

عبدالله دەستی گرت ماچیان بکات، دایکی گوتی: ئەمە خودا حافیزە و ماڵئاواییە، دوور مەکەوەوە، عبدالله گوتی: بۆیە هاتووم، خواحافیزەت لێ بکەم: چونکە پێم وایە ئەمە دوایین ڕۆژی ژیانمە، گوتی: بڕۆ بە چاوی ڕوونەوە، لێم نزیك

---

١ـ تاريخ الطبري (٧/٧٦).

بەوە، تا بە خودات بسپێرم، لێی نزیك بۆوە، دەستەملانێی کرد و ماچی کرد و دەستی بە زرێی بەری کەوت.

گوتی: ئەمە کاری یەکێکە نیازێکی لە دڵدا بێت.

گوتی: تەنها بۆ ئەوەم لەبەر کردووە تا بە تۆ ڕابگەم.

گوتی: ئەوە بە منت ڕاناگەیەنێت.

ئینجا زرێکەی بەری داکەند و قۆڵی لێ هەڵماڵی و ئاودامانی کراسەکەی گورج کرد، ژێر کراسێکی چنراو لە خوری و ئاوریشمی لەبەر بوو، لچقەکەی لە پشتێنی هەڵچەقاند.

دایکی گوتی: خاو و خلیسك مەبە و جلەکانت بە توندی لە خۆت باڵێنە.

ئینجا (ئیبن زوبێر) ڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

إني اذا اعرف يومي أصبر
وأيما يعـرف يومـه الحـرّ

دایکی گوێی لەم قسەیەی بوو و گوتی:

سوێند بەخوا، بەویستی خودا، ئارام دەگری، باپیرەت (ئەبو بەکر و زوبێر)ن، دایە گەورەت صەفییەی کچی عبدالمطلب.[1]

**٤ ــ شەهید بوونی (ئیبن زوبێر) ڕەزای خوای لێ بێت:**

مانەوە لەسەر بیروباوەڕ ئەگەرچی جێی مەترسی بێت و بە دژی بەرژەوەندیەکانی خاوەنەکەی بێت، بەڵام بە بەرزترینی سیفەتە جوانەکان دادەنرێت، ئەم سیفەتە بە تۆخی لە کەسایەتی (ئیبن زوبێر)دا ڕەنگی دابۆوە، بۆیە لە ڕێی بانگەشەکەیدا تا دوا هەناسەی ژیانی تێکۆشا و نەبەزی و لاوازی لێ بەدەر نەکەوت و سەری دانەنەواند.

دواهەمین ڕۆژی ژیانی بوو، دوو ڕکات نوێژی سونەتی بەیانی کرد، ئینجا چووە پێشەوە و بانگدەر قامەتی بۆ کرد، پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی کرد، سوڕەتی ﴿نٓ

---

١ـ تاريخ الطبري (٧/٧٧).

﴿وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ی پیت بە پیت خوێند، ئینجا سەلامی نوێژی دایەوە، هەستایە سەر پا، سوپاس و ستایشی خودای کرد و وتارێکی کاریگەری دا، تێیدا گوتی: بەبەرکەوتنی شیر سامتان لێ نەنیشێت، چەندین جار هێندەم وشیروتیر بەر کەوتوون بە نیوە مردوویی هەڵیان گرتوومەتەوە، جێی هەر برینێك لە ئەوی تریان قووڵتر و بە ئازار تر بووە، چۆن سەر و دەم و چاوتان دەپارێزن ئاوا شیرەکانتان بپارێزن، پیاوێکم دەست ناکەوێت بەدەستی خۆی شیرەکەی خۆی شکاندبێت و دوایی خۆی هێشتبێتەوە لەژیاندا، مرۆڤ کە چەکی نەما وەکو ژن لاپەڕ دەبێت، چاوتان مەبڕنە ڕزق وبەڕقی دنیا، هەر کەسێك لە ئێوە با پەیوەندی بە هاوەڵەکەی خۆیەوە هەبێت، پرسیارکردن لە من خەریکتان نەکات، مەڵێن: عبدالله ی کوڕی زوبێر لە کوێیە؟ ئەوا من لەگەڵ دەستە و تاقمەی یەکەمم:

أبي لابن سلمى أنه غير خالد ملاقـي المنايـا أي صـرف تيممـا
فلسـت بمبتـاع الحيـاة بـسبّة ولا مرتق من خشية الموت سُلّماً

لەسەر بەرەکەتی خودا هێرش بەرن، هێرشیان بۆ بردن تا(حەجون) پاشەکشەیان پێ کردن لە مەنجەنیقەوە بەردێکی تێگیرا و بەر دەم و چاوی کەوت و تاساندی، دەم و چاوی خوێناوی بوو، کاتێك هەستی بە گەرمایی خوێن کرد کە بەسەر دەم و چاو و ڕیشیدا دێتە خوارەوە، گوتی:

فلسنا على الاعقاب تدمى كلو منا ولكـن علـى اقـدامنا تقطـر الـدما[١]

ئینجا شەڕێکی دەستە و یەخەی لەگەڵ کردن، ئەوانیش بە هەموان گەلەکۆمەکیان لێکرد، ڕۆژی سێ شەممە و لە مانگی جەمادی دووەمدا و لە تەمەنی (٧٣) ساڵیدا کوشتیان.[٢]

١ـ تاريخ الطبري (٧٩/٧).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٧٣/٣).

پیاوێکی هۆزی (مراد) کوشتنەوەی گرتە ئەستۆ، سەرەکەی بۆ حەجاج برد، (حەجاج و تاریقی کوڕی عبدالله) بەرامبەر بە سەری عبدالله ڕاوەستان.

تاریق گوتی: ژنان لەمەیان زیرەکتر نەهێناوەتە دنیا.

حەجاج گوتی: بە دوژمنی ئەمیری ئیمانداران هەڵدەڵێی؟

(تاریق) گوتی: بەڵێ ئەو بەهانەی داینە دەست، ئەگەر ئەوە نەبووایە هیچ بەهانەمان نەدەبوو، ئێمە ماوەی (٧) مانگە گەمارۆمان داوە، بەبێ ئەوەی هێزێکی سەربازی و قەڵایەکی دامەزراوی هەبێت، وەکو ئێمە ڕاوەستاوە و، بەڵکو لە ئێمەیش زیاتر، دەم بە دەمەکیان گەیشتەوە عبدالملك ، گوتی: تاریق ڕاست دەکات.[1]

کاتێك (ئیبن زوبێر) بە داردا کرا بۆنی میسکی لێ پەخش بوو.[2] دەڵێن: (ئیبن زوبێر) لە ڕۆژی شەهید کرانیدا گوتبووی: ئیمرۆ بە کوژراویم دەبیننەوە، ئیمشەو خەونم بینی: (ئاسمانم بۆ کرایەوە و چوومە ناوی)، بە خوا لە ژیان و گوزەرانی دنیا ماندوو بووم.[3]

**٥ ـ ئەسمائە بەڵگە لە دژی حەجاج ڕاست دەکاتەوە:**

کە عبدالله کوژرا ئەسمائە هاتە دەر و بە سواری وڵاخێك بۆ لای ڕۆیشت و لە بەرامبەری ڕاوەستا، حەجاج لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی هاتە لای، پرسیاری ئەسماء کرد و نیشانیاندا، بەرەو پیری ڕۆیشت و لە بەرامبەری ڕاوەستا و گوتی: چۆنت بینی؟ خودا هەقی سەرخست و بە دەری خست؟ لەوانەیە ناهەق بەسەر هەقدا زاڵ بێت، ئێستا تۆ لە نێوان سەرانگوێلکی زەلکاوی ناهەق ڕاوەستاوی.

حەجاج گوتی: کوڕەکەت لە نێو ماڵی خودادا ستەمی دەکرد، خودای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الحج: ٢٥).

---

١ـ تاريخ الطبري (٧٣/٣).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٧٣/٣).

٣ـ سير اعلام النبلاء (٣٧٨/٣).

ئەوا خودا سزای دا و ئازاری بە ئێشی چەشت.

ئەسماء گوتی: درۆت كرد، ئەو یەكەمین لە دایك بووی ئیسلامە لە (مەدینە)دا، پێغەمبەر (ﷺ) بە هاتنە دونیای شاد بوو، پەنجەی پیرۆزی خستە بن مەلاشووی، موسڵمانان تەكبیریان لێدا و شاری مەدینە لە خۆشیان دەدرەوشایەوە، ئێستاش دەبینم تۆ و تاقمەكەت بە كوژرانی شادومانن، ئەوانەی لە ڕۆژی هاتنە دونیای شادومان بوون زۆر زۆر باشتر و چاكترن لە تۆ و تاقمەكەت، كە بە لەدنیا دەرچوونی شادومانن، لەگەڵ ئەمەدا عبداللە بۆ باوك و دایكی چاك بوو، ڕۆژانی بە ڕۆژوو بەڕێدەكرد و شەوانی بە شەو نوێژ و قورئان خوێندن بەسەر دەبرد، حەرامەكانی خودای بە گەورە دادەنان، كە سەرپێچی خودا دەكرا تووڕە دەبوو و ڕقی هەڵدەستا.[١]

ئەسماء بەم شێوازە بەرگریەكی پڕ شكۆی لە كوڕە شەهیدەكەی كرد، حەجاج شكستی خوارد و لەوێ ڕۆیشت، ئەمە گەیشتەوە عبدالملك ، نامەیەكی بۆ حەجاج نارد و لۆمە و سەرزەنشتی كردبوو گوتبووی: چیت داوە لە كیژی پیاوە چاكەكە.[٢]

### ٦ ـ ستایشكردنی (ئیبن زوبێر) دوای شەهید بوونی لە لایەن (ئیبن عومەر)ەوە:

كە(زوبێر) شەهید كرا و پاشانیش بەسێدارەواكرا، عبداللە ی كوڕی عومەر چوو بۆ لای، گوتی: سلاوی خوات لێ بێت ئەی (ئەبی خوبەیب)، سلاوی خوات لەسەر بێت ئەی (ئەبی خوبەیب)، بەلام بە خوا من ڕێگری ئەم چارەنووسەم لێ دەكردی (٣) جار. سوێند بە خوا ئەگەر چاكم نەناسیبای و نەمزانیبا، ڕۆژوگر و شەونوێژكەری و سیلەی ڕەحم بەجێ دەگەیەنی، ئەوا دەمگوت: تۆ خراپترین كەسی نێو ئومەتێكی چاك و پاكی)، ئینجا عبداللە ڕابووری و هەواڵی وەستانەكەی و

---

١ـ البداية والنهاية (١١/٢٥٩).
٢ـ البداية والنهاية (١١/٢٥٩).

قسەکانی بە حەجاج گەیشتەوە، چەند کەسێکی ناردە لای (ئیبن عومەر) و ئەویش لە داری دابەزاند.[١]

**٧ ــ بەیعەتدانی (ئیبن عومەر) بە عبدالملك :**

کاتێك خەڵك بە گشتی بەیعەتیان بە عبدالملك دا، (ئیبن عومەر) بۆی نووسی، بەڵام پاشان ئەوا من بەیعەتم دا بە (عبدالملك)ی ئەمیری ئیمانداران، بەیعەتی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بە پێی سوننەتی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی بە گوێرەی توانا.[٢]

بە پێی گێڕانەوەیەکی تر: (ئیبن عومەر) لە نامەکەیدا ناوی خۆی خستبووە پێش ناوی عبدالملك و ئەمەی نووسیبوو: بەڵام پاشان: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ﴾ (النساء: ٨٧). پێم گەیشتووە موسڵمانان جەم بوون لەسەر بەیعەت پێدانت، منیش چوومە نێو ئەو پەیمانەی موسڵمانان چوونە ناویەوە، والسلام.[٣]

ژمارەیەك دەست و پێوەندی خەلیفە ویستیان دڵی خەلیفە لە بەرامبەر (ئیبن عومەر)دا تێك بدەن، چونکە ناوی خۆی لە پێش ناوی (خەلیفە)دا نووسیووە، عبدالملك گوتی: ئەوەندە لە لایەن (ئەبو عبدالرحمان)ەوە بۆ من زۆرە.[٤] لەنامەیەکیدا بۆ حەجاجی نوسیبوو: نابێ لە کاروباری (حەج)دا سەرپێچی عبدالله ی کوڕی عومەر بکات،[٥] چونکە دەیزانی (ئیبن عومەر) پایەدار و شارەزایە.[٦]

---

١ـ هەمان سەرچاوە (١١/٢١٠).
٢ـ الطبقات (٤/١٥٢).
٣ـ الطبقات (٤/١٥٢).
٤ـ عبدالله بن عمر، محي الدين مستو ص (١٠٨)، الطبقات (٤/١٥٤).
٥ـ نسب القريش ص (١٠٨).
٦ـ عبدالله بن عمر، محي الدين مستو ص (١٠٨).

٨ ــ (ئیبن عومەر) و حەجاج:

دوای کۆتایی هاتنی (ئیبن زوبێر) حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی وەك والی لە (مەککە)دا مایەوە، عبدالله‌ی کوڕی عومەر بەمەبەستی ئەنجامدانی (حەج) یان (عومرە) (مەدینە)ی بەجێ دەهێشت و دەرچووە (مەککە)، گوفتار و کردەوەکانی حەجاجی دەبیستن و دەدیتن پێچەوانەی شەرعن، دەچووە لای و فەرمانی پێدەکرد چاکە بکات و لە خراپەکاری دووربکەوێتەوە، بە هەموو جورئەت و ئازایەتیەوە بەرەنگاری حەجاج دەبۆوە و ڕەدی گوفتار و کردارەکانی دەدایەوە.[1]

حەجاج دوای زاڵبوونی بەسەر (مەککە)دا وتارێکی دا و گوتی: (ئیبن زوبێر کتێبی خوای دەستکاری دەکرد، لە ڕیوایەتێکی تردا هاووە: کتێبی خودای دەگۆڕی).

(ئیبن عومەر) هەستا و گوتی: درۆت کرد، درۆ دەکەی، درۆ دەکەی، نە ئەو نە تۆ ناتوانن ئەم کارە بکەن.[2]

حەجاج وتاری جومعەی دەدا، هێندەی درێژ دادڕی خەریك بوو کاتی نوێژ بەسەر بچێت، (ئیبن عومەر) هەستا و گوتی: ئەی خەڵکینە، هەستن نوێژەکەتان بکەن، خەڵك هەستا و حەجاجیش لەسەر مینبەر دابەزی و نوێژی کرد، کاتێك خەریك بوو بڕوا بە (ئیبن عومەر)ی گوت: چ شتێك هەلێ نای ئەم کارە بکەی؟

(ئیبن عومەر) گوتی: ئێمە بۆ نوێژ کردن هاتووین نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە، ئینجا زۆر بلێی بکە، دوای ئەوە چەندت حەز لێیە بلێ.[3]

هەروەها (ئیبن عومەر) بەتوندی ناڕەزایی خۆی لە دژی حەجاج دەربڕیووە، سەبارەت بەو بێ ڕێزیەی دەینوێنی لە بڵاوکردنەوەی چەکوچۆڵ لە نێو حەرەمی (مەککە)دا و بەرەڵاکردنی پیاوەکانی بە نێو شاردا و تەنگ پێ هەڵچنینی موسڵمانان و ژیان لێ تاڵکردنیان.

١ـ عبدالله بن عمر، محي الدين مستو ص (١٠٨).
٢ـ الطبقات الكبرى (١٨٤/٤)، سير اعلام النبلاء (٢٣٠/٣).
٣ـ الطبقات (١٨٥/٤ ـ١٨٦)، سير اعلام النبلاء (٢٣٠/٣).

لە گێڕانەوەیەکی (صحیح)دا، سەعیدی کوڕی جوبێر دەڵێ: کاتێك (ئیبن عومەر) نوکە ڕمبەکەی بەرکەوت لەگەڵیدا بووم، ئەم نوکە ڕمبە لە ئاوزینگی ولاخەکەیدا لە بنە پێی هەڵچەقی، لە ولاخەکەم دابەزیم و بۆم دەرکێشا، ئەم ڕووداوە لە (مینا) بوو لە کاتی ڕەجمدا بوو، ئەم هەواڵە گەیشتە حەجاج و سەردانی کرد، حەجاج گوتی: ئەگەر دەمزانی کێ ئەم ڕمەی تێگرتووی؟

(ئیبن عومەر) گوتی: تۆ تێت گرتم و هەنگاوتم.

حەجاج گوتی: چۆن؟ (ئیبن عومەر) گوتی: لە ڕۆژێکی وەکو ڕۆژانی جەژن و ڕەجمدا چەکت هەلگرتووە، کە نەدەبوو هەڵت بگرتایە، نەخۆت و نە پیاوەکانت، چەکت هێنایە نێو (حەرەم)، نابێ چیکیش بێتە نێو (حەرەم)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ئیسحاقی کوڕی سەعید دەڵێ: بابم گوتی: کاتێ حەجاج سەردانی (ئیبن عومەر)ی کرد من لەوێ بووم، گوتی: ئەو چۆنە؟ گوتی: باشە، گوتی: چیت بەرکەوتووە؟ گوتی: ئەو کەسە بە سەرە ڕمب هەنگاوتمی کە فەرمانی دا چەك هەڵبگیرێ لە ڕۆژێکدا کە حەلاڵ نەبوو چەکی تێدا هەڵبگیرێت: مەبەستی حەجاج بوو.[1]

کاتێك حەجاج چووە دەرەوە و ڕۆیشت، (ئیبن عومەر) گوتی: لە ژیانی دنیامدا تەنها ئاخ و خەفەت بۆ (٣) شت هەڵدەکێشم: لەم سێ شتانە ئەمەی باس کرد:

شەڕ نەکردنم لە دژی ئەم کۆمەڵە و تاقمە ستەمکارەی ئەو هەموو خراپەیان بەسەر هێناوین،[2] (ذهبي) دەربارەی تاقمە ستەمکارەکە دەڵێ: مەبەستی پێ حەجاو تاقمەکەی بووە.[3] منیش دەڵێم: ئەوەی ناردووشیەتی.

**٩ ــ بەرنامەی (ئیبن عومەر) لە کاتی ئاشووبەکاندا:**

(ئیبن عومەر) لە گۆڕەپانی ڕووداوە سیاسیەکان دوورە پەرێز نەبوو، بەڵکو تێبینی و لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی بۆ تەواوی بێنە و بەردە و گۆڕانکارییەکان هەبوو، ئەو بە هەڵوێستە زەق و دیارەکانی لە بەرامبەر ئەو فیتنە و ئاشووبانەی

---

١ـ سير اعلام النبلاء (٣/٢٣٢).

٢ـ سير اعلام النبلاء (٣/٢٣٢).

٣ـ الطبقات (٤/١٨٥).

تووشی ئوممەتی ئیسلامی ببوون لە خەڵکانی تر جیادەکرایەوە.

دەکرێ بڵێم ئەم ئاشوب و ئاژاوانە پەردەیان لەسەر حیکمەتێکی فراوان و بیروبۆچوونێکی ڕووناك هەڵدایەوە کە پێویستە دەربارەی ڕووداوەکان بگرێتەبەر.

لەڕاستیدا (ئیبن عومەر) و بۆچوون و هەڵوێستەکانی لەو سەردەمەدا: وەك مامۆستا و قوتابخانەیەك بوو، خەڵکانێکی زۆر چاویان لێ دەکرد و بەرچاویان ڕۆشن دەبۆوە و شوێنیان هەڵدەگرت.[١]

سوفیانی سەوری دەڵێ: شوێن پێی (عومەر) هەڵدەگیرێ لە جەماعەتدا، شوێن پێی کوڕەکەشی هەڵدەگیرێ لە کاتی پەرتەوازەییدا.[٢]

گرنگترین ڕەفتاری (ئیبن عومەر) لە بەرامبەر ڕووداوەکانی ئاشووبدا:

**أ ــ دووره پەرێزی لە کوشتار و داکۆکی کردن لەسەر خوێنی موسڵمانان:**

چەند ڕیوایەتێك ئەم هەڵوێستەی(ئیبن عومەر) لەهەردوو کاتی ئاشووبی یەکەم و دووەمدا ڕۆشنتر دەکەنەوە.

قاسمی کوڕی عبدالرحمن گوتی: لە ئاشووبی یەکەمدا بە (ئیبن عومەر)یان گوت: ناچیتە دەر و جەنگ بکەی؟ گوتی: کاتێك جەنگم کردووە کە بتەکانی لە نێوان (ڕوکن) و (دەرگا)ی (بەیت) دانرابوون، تا خوا لە خاکی عەرەب نەیهێشتن، من حەز ناکەم شەڕ لەگەڵ کەسێك بکەم و بڵێ: (لا اله الاّ الله)....

گوتیان: ئەی بیروڕات چیە؟ تۆ دەتەوێ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکتر لە نێو بەرن و کەسیان نەمێنێت و پاشان بگوترێ: بەیعەت بدەن بە (عبدالله ی کوڕی عومەر)و بیکەنە ئەمیری ئیمانداران.

گوتی: وەڵاهی ئەمە لە دڵی مندا نییە، بەڵام ئەگەر گوتتان: (حيّ على الفلاح) بە دەمتانەوە دێم، بەڵام کە ئەگەر پەرتەوازە بن لەگەڵ کەستان نابم، ئەگەر هەمووشتان کۆك بن لێتان جودا نابمەوە.[١]

---

١ـ أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية ص (٣٢٥).
٢ـ عبدالله بن عمر، محي الدين مستو ص (١١٢)

لە کاتی ئاشووبی (ئیبن زوبێر)دا. دوو پیاو هاتنە لای و گوتیان: خەڵك بە بیروڕای خۆیان دەست بەکار بوون، تۆش (ئیبن عومەر)ی و هاوەڵی پێغەمبەری خوای، چ شتێك ڕێگای چوونە دەری لێ گرتووی؟

(ئیبن عومەر) گوتی: پێتان دەڵێم: خودا لەسەری حەڕام کردووم خوێنی برای موسڵمانم برێژم.

گوتیان: ئەی خودای بەرز نەیفەرمووە: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ﴾البقرة: ١٩٣.

گوتی: کاتی خۆی جەنگمان کرد تا ئاشوب نەما و گەردنکەچی بۆ خودا هاتەدی.

کاتێك تێگەیشتن ڕای ئەو لەگەڵ ڕای ئەوان تێك ناکاتەوە، گوتیان: دەربارەی عەلی و عوسمان چ دەڵێی؟

(ئیبن عومەر) گوتی: قسەم لەسەر عوسمان و عەلی چۆن و چ بێ؟! کاتێك دەبینم: عوسمان خودا لێی خۆش بووە، بەڵام ئێوە پێتان ناخۆشە خودا لێی خۆش بووە، (عەلی)یش: خۆ ئامۆزای پێغەمبەری خودایە(ﷺ)و زاوایەتی و بە دەستی ئاماژەی کرد و گوتی: ئەمەش ماڵەکەیەتی وەك دەبینن.[٢]

ئیبن عومەرﷺ هەر بەوە نەوەستا خۆی لە شەڕ و براکوژی دوورخاتەوە، بەڵکو چەند ڕێگایەکی تریشی گرتەبەر لە پێناو دوورخستنەوەی موسڵمانان لە خوێنڕێژی نێوانیان، لە سەردەمی ناکۆکی نێوان (ئیبن زوبێر) وعبدالملك ی کوڕی مەروان دا هەوڵی جیددی دا بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕی نێوانیان و ڕاگرتنی خوێنڕێژی موسڵمانان.[٣]

---

١ـ حلیة الاولیاء (١/٢٩٤).

٢ـ ڕیوایەتێکی (واهذا بنته) واتە ئەمەش کچەکەیەتی بە پێی ڕیوایەتەکەی سەرەوە (وهذا بیتە) ئەمەش ماڵەکەیەتی.

٣ـ أثر العلماء في الحیاة السیاسیة ص (٣٢٨).

مداتني دەگێڕێتەوە: عبدالله ی کوڕی عومەر نامەیەکی بۆ عبدالملك نووسی و تێیدا: فەرمانی پێکردبوو: لە خوا بترسێ و خۆی لە شەڕ بکشێتەوە، عبدالملك بۆی نووسیبۆوە: کە ئەو لەمەولا واز لە دەسەلات دێنێت و کاروبار بە (شورا) بەڕێوەدەبا.

کاتێك (ئیبن عومەر) ئەمەی بۆ (ئیبن زوبێر) نووسی: ئاوڕی لێ نەدایەوە.[1]

**ب ـ هاندان بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ئیمام، بەرگرتن لە هەڵایساندنی فتیلەی ئاشوب و پەرتەوازەیی لە ڕادا:**

ئیبن عومەرﷺدەڵێ: لە خیلافەتی عوسماندا یەکێك بۆ لام هات، دەبیستم فەرمانم پێ دەکات گازندەی عوسمان بکەم!، کە قسەکەی تەواو بوو، گوتم: ئەو کاتەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێوانماندا بوو، دەمانگوت: دوای پێغەمبەر (ﷺ) باشترین کەسانی ئوممەتەکەی بریتین لە: (ئەبو بەکر) ئینجا (عومەر) دوایو ئەویش عوسمان، وەڵڵاهی ئێمە نەمانزانیووە عوسمان کەسی بە ناهەق کوشتبێ و تاوانێکی گەورەی ئەنجام دابێ، ئێوە دەتانەوێ وەکو فارس و ڕۆم ڕەفتار بکەن، ئەوان سەرۆکەکانیان بە کوشتن نەبێ نامرن، چاوەکانی (٤) فرمێسمیان هەڵوەراندن، ئینجا گوتی: اللهم لاترد ذلك:[2] خوایە ئەمە ڕوونەدا.

سالمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەر دەڵێ: بابم گوتی: عوسمان هەندێ کاری بە چەنجام گەیاندن، خەڵك گاتزندەیان کرد، ئەگەر (عومەر) ئەم کارانەی ئەنجامدابان کەس گازاندەی نەدەکرد و ورتەی لێوە نەدەهات.[3]

بنۆڕەعبدالله ی کوڕی عومەر چەندە سوور بووە لەسەر بەرگری کردن لە عوسمانی کوڕی عەفان و پاراستنی کەرامەتی و بەرپەرچ دانەوەی ئەو تۆمەتانەی خەڵکی ئاژاوەگێڕ لە دژی عوسمان دروستیان دەکرد، کاتێك عوسمان زانی مەینەتەکە دەورە بووە و خەریکە سەر دەکێشێت بۆ لێدانی، بانگی عبدالله ی کرد و

---

١انساب الاشراف (١٩٥/٥).

٢ المعجم الكبير للطبراني (٢٨٥/١٢)، ابن عمر، محي الدين مستو ص (٨٢).

٣العواصم من القواصم ص (١٠٤ ـ١٠٥)، ابن عمر، محي الدين مستو ص (٨٣).

دەربارەی گەلەکۆمەی ئاژاوەچییەکان ڕاوێژی پێکرد، عوسمان پێی گوت: بڕوانە ئەوانە دەڵێن چی؟! دەڵێن: (یان واز بێنە یان دەتکوژین، (ئیبن عومەر) گوتی:

ئایا تۆ هەتایە لە دنیادا دەمێنی؟

عوسمان گوتی: نا، عبدالله وتی: زیاد لە کوشتن چی کەت بەسەر دەهێنن؟

عوسمان گوتی: نا، (ئیبن عومەر) گوتی: ئایا بەهەشت و دۆزەخی تۆیان لە لایە؟

عوسمان گوتی: نا، (ئیبن عومەر) گوتی: کەواتە ئەو کراسەی خودا لەبەری کردووی دای نەنێی، دەنا دەبێتە سوننەتێك، هەرکات خەڵکانێك لە (خەلیفە) بێزار بن: یان وازی پیێ لێ دێنن، یان دەیکوژن.[1]

ئەم ڕاوبۆچوونەی (ئیبن عومەر) بەڵگەیە لەسەر دووربینی و خوێندنەوەی زیرەکانەی ئەو بۆ پاشەڕۆژ و دەرەنجامی کاروبارەکان، ئەو ئامادەیی خۆی دەربڕی: چەك هەڵگرێت و بەرگری لە عوسمانی ئەمیری ئیمانداران بکات و بەرەنگاری ئاژاوەچییەکان و گەمارۆدەرانی ماڵی خەلیفە ببێتەوە.

(ئیبن سەعد) لە (نافیع)ەوە دەگێڕێتەوە:

(ئیبن عومەر) لە ڕۆژی گەمارۆدانی عوسماندا دووجار خۆی زرێپۆش کرد، کاتێك عوسمان کوژرا: تەماشای کرد ئوممەت کەوتۆتە تەنگژەی مەینەتەوە، چونکە کوژرانی (خەلیفە) بەم شێوازە تاوان و سەرپێچیە و بەلایەکی سامناکە و ئەنجامەکەی لەسەر ئوممەتدا دەشکێتەوە، بۆیە کاتێك ئاژاوەچییەکان خەلیفەیان شەهید کرد و پۆستی خیلافەتیان خستە پێش (ئیبن عومەر) گوتی: ئەم کارەتان تۆڵەی خۆی هەیە، بە خوا خۆی بۆ تەرخان ناکەم، بڕۆن یەکێکی تر دانێن.[2]

ئیبن عومەر (ﷺ) ئامۆژگارییەکانی خۆی بۆ خەڵك چڕ کردبۆوە لە یەکگرتوویی و برایەتی و دوورکەوتنەوە لە پەرتەوازەیی و ناکۆکی و براکوژی و ڕشتنی خوێنی یەکتری بە ناهەق.

---

١ـ العواصم من القواصم ص (١٣٠).

٢ـ تاريخ الطبري، نقلا عن أثر العلماء في الحياة السياسية ص (٣٣٢).

پیاوێك بۆی نوسیبوو: هەموو زانستم بۆ بنووسەوە، ئەویش بۆی نوسیبۆوە: زانست فراوانە، بەڵام ئەگەر پێت خۆشە بە ئاسانی بگەڕێیتەوە لای خودا: ئەوا با کۆڵت سووك بێ و خوێنی موسڵمانان مەخە کۆڵتەوە، با سکت ماڵی موسڵمانانی نەکەوێتە ناوەوە، زمانت لە باسکردنی نامووسی موسڵمانان بگرەوە پابەند بە بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، ئەمە بکە، والسلام.[1]

**ج ـ بە دەمەوەچوونی بانهێشتی لایەنە ناکۆکەکان بۆ هاوکاری لە چاکەکردنادا بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی:**

گێڕدراوەتەوە: (ئیبن عومەر) لە سەردەمی ئاشوب و پشێویدا چووبێت لای هەر ئەمیرێك، نوێژی لە دواوە کردووە و زەکاتی ماڵی خۆی داوەتێ.[2]

پێی گوترا: نوێژ لەگەڵ ئەمە دەکەی و لەگەڵ ئەوەش دەکەی کە یەکتری دەکوژن؟!.

ئیبن عومەر گوتی: هەر کەس بڵێ: (حيّ على الصلاة) بە دەمیەوە دەچم، کێ بڵێ: (حيّ على الفلاح) بە دەمیەوە دەچم، بەڵام هەر کەس بڵێ: (حيّ على أخيك المسلم وەرە بە گژ برای موسڵمانتدا بچۆ دەڵێم: نا.[3]

ئیبن عومەر پێگەیەکی بەرزی لە نێو ئوممەتدا هەیە، چونکە هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوای کردووە و زانا و خوداپەرست و دنیا نەویست بوو، عبدالله ی کوڕی موحەیریز ڕەحمەتی خوای لێ بێت عبدالله ی کوڕی عومەری بە هەوێنی هێمنایەتی سەر زەوی وەسف کردووە و دەڵێ: وەڵڵاهی مانەوەی (ئیبن عومەر) لە ژیاندا بە مایەی ئەمان و هێمنی دادەنێم بۆ خەڵکی سەر زەوی.[4]

---

١ـ تاريخ ديمشق، نقلا عن أثر العلماء في الحياة السياسية ص (٣٣٤).
٢ـ الطبقات الكبرى (١٤٩/٤).
٣ـ هەمان سەرچاوە (١٧٠/٤).
٤ـ تهذيب التهذيب (٣٣١/٥)، أثر العلماء في الحياة السياسية ص (٣٣٧).

**د ـ (ئیبن عومەر) بانگەشەی واجب بوونی گەردنکەچی ڕەهای بۆ سوڵتان نەکردووە:**

**وـ بەیعەتدانی بە زۆریشی بە جەواز دانەناوە، یان ئەوەی لە ژیانیدا بەدی دەکرێت کە گوایە بەڵگەیە لەسەر گرنگی نەدانی بە کاروباری سیاسی موسڵمانان:**

چونکە بەشداری تێدانەکردووە: بە پێچەوانەوە: بەڵکو عبدالله هەمیشە پارسەنگێك بووە لە هاوکێشەی سیاسی سەردەمی ئومەویدا، شێوازی کاری: گفت و گۆ کردن و پەنا بردن بووە بۆ شورا و دوورکەوتنەوە بووە لە براکوژی، کاتێکیش ناکۆکی و هەرا لە نێو موسڵماناندا سەری هەڵدا، بێلایەنی و دوورەپەرێزی خۆی ڕاگەیاند، ئەم کارەی بریتی نەبوو لە خۆ دوورخستنەوە لە کاری سیاسی و ژیانی سیاسی، بەڵکو جۆرێك بوو لە تێڕامان و بیرکردنەوە و ئاگادار بوون بەسەر هەڵوێستی لایەنە ناکۆکەکان و دوورکەوتنەوە لە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان و ململانێ کردن لە پێناوی سوڵتە و دەسەڵاتدا، لەگەڵ کارکردنی بەردەوام و شێلگیرانەی بۆ خۆشکردنی زەمینەیەکی لەبار و کەش و هەوایەکی گونجاو کە هێز و لایەنەکانی ئوممەت کۆدەکاتەوە لەسەر یەك، لە لایەکی ترەوە هەڵوێستی بێ لایەنی (ئیبن عومەر) لە سەرەتای ڕووداوەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ مەترسی کەوتنە نێو فیتنە و ئاژاوەکانەوە و یەکلا بوونەوەش بۆ لایەنێکیان کارێکی گران بوو بە لایەوە.[1]

(ئیبن عومەر) دەیگوت: ڕێم بە خۆم نەدا دەستم بچێتە شەڕەوە و پەژێوانیش نیم، مرۆڤ جەنگاوەری ڕێی هەق بێ فەزڵی زۆرتر و باشترە.[2]

لێرەدا چەندین بەڵگە و حەقیقەتی مێژوویی هەن دەیسەلمێنن: کە کاتێك (ئیبن عومەر) حەجاجی بینی چ ستەمێکی گەورە لە حەرەمی (مەککە) ئەنجام دەدا و خوێنڕێژی تێدا دەکات و بێ ڕێزی خۆی و سوڵتەکەی بەرامبەر بە پیرۆزی حەرەم دەنوێنێت، بەڵێ لەو کاتەڕا بیروڕای خۆی لە بێلایەنی گۆڕیوە، بەڵکو پەشیمان

١ـ مع المسلمین، مصطفی الحلمی (ص: ٥٤).
٢ـ الطبقات (٤/١٦٤).

بۆتەوە کە لە ڕێزی سوپاکەی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)دا نەبووە و دژی (معاویە) نەجەنگاوە، چونکە بە بۆچوونی ئەو (معاویە) یاخی بووە و لە دژی شەرعیەتی (عەلی) دەرچووە و بە باغی و یاخی و ستەمکار دێتە هەژمار، (حەبیبی کوڕی سابیت) دەگێڕێتەوە: (ئیبن عومەر) لە کاتی سەرەمەرگیدا گوتی: شتێکی خراپ لە خۆمدا بەدی ناکەم، جگە لەوە لەگەڵ (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) لە دژی تاقمە یاخیەکە نەجەنگام.[1]

کەمێك لەوەپێش وتەیەکی تریمان گێڕایەوە کە گوتبووی: (لە ژیانی دونیامدا جگە لە (٣) شت مەراق بۆ هیچ شتێك ناخۆم: یەکەم بەڕۆژوو بوونی ڕۆژگار، دووەم شەونوێژی شەوگار، سێیەم لە دژی تاقمە یاخیەکەش شەڕم نەکرد کە ئەوەی نەشیا بەسەریان هێنان)،[2] (هبي) دەڵێ: مەبەستی لە تاقمەکەی حەجاجە.[3]

لە هەندێ کتێبی (مێژوو)دا هاتووە: کە گوایە ئیبن عومەر عبدالله ی کوڕی زوبێریشی لە کۆمەڵی یاخی و ستەمکار و ڕێزپەڕ هەشماردووە، پەشیمان بۆتەوە لەوەی لە دژی نەجەنگاوە، چونکە بە دەرچوو دادەنرێت لە ژێر حوکمڕانی (بەنی ئومەییە) و ستەمی لێکردوون پەیمانەکەی هەڵوەشاندوونەوە.[4]

ئەم ڕیوایەتە چەند تێبینی و ڕەخنەی لەسەرە:

ـ ئەگەر (عبدالله ی کوڕی عومەر) لە کاتی ئاشوویدا باوەڕی ئاوا بووایە کە (بەنی ئومەییە) لە پێشترن و شایانترن بۆ (خیلافەت لە (ئیبن زوبێر)، بێ شك بەیعەتی دەدانێ، بەڵام ئەمەی نەکرد، جا چۆن پەشیمانە لە ڕێزی ئەواندا نەبووە بۆ شەڕ، کە لە کاتێکدا ئەسڵەن بەیعەتی نەداونێ!!

ـ قسەکانی تری (ئیبن عومەر) کە لە ڕیوایەتە ڕاستەکاندا هات جەخت لەسەر کۆمەکی باغی و یاخی دەکەنەوە کە (بەنی ئومەییە) و پیاوەکانیان بوون، بە

---

١ـ سير اعلام النبلاء (٣/٢٣٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە (٣/٢٢٩).

تایبەتیش حەجاج، قسەکانی دواژیانی پشتیان پێ دەبەستری و سەنەدی ڕیوایەتەکانیشیان (صحیح)ن.[١]

ئەم هەڵوێستانەی بەشداری ئەم ڕایە پوچەڵ دەکەنەوە کە (ئیبن عومەر) بە پێشەنگی (قوتابخانەی گەردنکەچی سیاسی ی سوڵتان) دادەنێن، بە تایبەتی (ئیبن عومەر) ئەو کەسەیە کە ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ەوە گێڕاوەتەوە: ((على المرء المسلم السمع والطاعة فيما أحب أو يكره إلاّ أن يؤمر في معصية فلا سمع ولا طاعة)).[٢]

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی نەکردنی سوڵتان کاتێك فەرمانی بە سەرپێچی کردن دەرکرد و لە فەرمانی خودا دەرچوو، بۆیە ناکرێت (ئیبن عومەر) پێچەوانەی فەرموودەیەك بجووڵێتەوە کە خۆی گێڕابێتیەوە، ڕاو بۆچوونی (ئیبن عومەر) ڕاست ئەمەیە: (گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بۆ ئەو خەلیفە شەرعیەیە کە بە یەکدەنگی و ڕای زۆرینەی موسڵمانان هەڵبژێردراوە و بەیعەتی پێدراوە، واجبە گوێڕایەڵی بۆ بکرێ، مادام فەرمانی بە سەرپێچی کردن ناکات، ئەگەر ستەمی کرد و لایدا نابێ گوێڕایەڵی بکرێت، بەڵکو پێویستە ئامۆژگاری بکرێت، ئەگەر ئامۆژگاری سوودی نەبوو لەو کاتەدا پێویستە پەنا بۆ دژایەتی کردنی ئاشکرا ببردرێت، بەڵام پەنابردن بۆ توند و تیژی و شەڕ لەگەڵ کردنی مەکروهە، چونکە خوێنی تێدا دەڕژێت و یەکێتی کۆمەڵی موسڵمانان لاواز دەکات.[٣]

**١٠ ــ بەرنامە و بیروڕای (ئەهلی هەق) دەربارەی (ئیبن زوبێر):**

نەوەوی لە سەرحی (موسلیم)دا دەڵێ: (ئیبن زوبێر) بە بیروڕای ئەهلی هەق ستەم لێکراوە، حەجاج و هاوەڵانی لە دژی دەرچوون، دوای کوژرانی (ئیبن زوبێر) حەجاج دەچێتە لای (ئەسمائە)ی دایکی و پێی دەڵێ: بینیت چیم بەسەر کوڕەکەت

١ـ الفقهاء والخلفاء، سلطان بن حثلين (ص: ٦٦).
٢ـ مسلم رقم (١٨٣٩).
٣ـ الفقهاء والخلفاء (ص: ٦٦).

هێنا؟!، (ئەسمائە) گوتی: تۆ دنیات لێ تێکدا، ئەویش ئەو دنیای لێ تێکدای، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داینێ: لە هۆزی (سەقیف)دا لە نێوبەرێك و درۆزنێك پەیدا دەبن، درۆزنەکەمان بینی واتە: (موختار)، بەڵام (لەنێوبەرەکە) خەیاڵ ناکەم جگە لە تۆ کەسێکی تر بێت.[1]

**١١ــ ڕوخاندنی (کەعبە) و بیناکردنەوەی لە سەردەمی (ئیبن زوبێر)دا:**

ساڵی (٦٤)ی کۆچی (ئیبن زوبێر) کەعبەی ڕوخاند، چونکە دیوارەکانی لار ببونەوە،[2] و داڕوخابوون لە سۆنگەی بەردبارانی مەنجەنیقەکەی (حصین ی کوڕی نەمیر) و سوپاکەی.[3]

کاتێك (ئیبن زوبێر) ویستی (بەیت) بڕوخێنێ، ڕاوێژی بە خەڵك کرد، جابری کوڕی عبدالله و عوبەیدوڵای کوڕی عومەیر دەربارەی ئەمە ڕای خۆیان دەربڕی، (ئیبن عەبباس) گوتی: ئەگەر ئەمە بکەی دەترسم کەسانێکیش دوای تۆ بێن و بە نۆرەی خۆیان بیڕوخێنن و چاکی بکەنەوە و ڕێز و حورمەتی بە کەم بزانن، بەڵام من پێم چاکە کوێی داڕماب‌ێ چاکی بکەیتەوە لە بەیت و لەو بەردانە گەڕێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ناردوون، (ئیبن زوبێر) گوتی: ئەگەر ماڵی هەر کەسێکتان بسووتێ دانانیشێت و ڕازی نابێت تا نۆژەنی نەکاتەوە، ئەی چ لە ماڵی خودای پەروەردگارتان دەکەن؟![4]

ئینجا (ئیبن زوبێر) (٣) ڕۆژ لەسەر یەك نوێژی ئیستیخارەی دەکرد و داوای لە خودا دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ڕێی خێری بۆ ڕوون بکاتەوە.[5]

ئینجا لە چوارەمین ڕۆژی تەکبیر و ڕا و ئیستیخارەدا بڕیاری تەواوی دا و خۆی بۆ ئەم کارە یەکلا کردەوە، خەڵك پەرت و بڵاو بوون، هەندێکیان بەرەو (تائیف) هەڵاتن، هەندێکی تریش بەرەو (عەرەفات)و (مینا) ڕۆیشتن، (ئیبن زوبێر) بە خۆی و

---

١ـ مسلم، رقم (٢٥٤٥).
٢ـ تاريخ الطبري (٦/٥٢٠).
٣ـ شذرات الذهب (١/٣٠٨).
٤ـ البداية والنهاية (١١/٦٩١).
٥ـ البداية والنهاية (١١/٦٩١).

عەبدێکی حەبەشی لاق باریك بە ئومێدی ئەوەی خاوەن قاچە باریکە حەبەشیەکەی بەیت دەڕوخێنێ ئەو بێ و بەس کە لە فەرموودەی (صحیح)دا ناوی هێنراوە دەست بەکار بوو.[١]

دەستی بە هەڵوەشاندنی دیواری (ڕوکن) کرد، تا گەیاندیە سەر بناغە تەماشایان کرد بناغەی بەیت گەیەنراوەتەوە بە (حیجر)ی ئیسماعیل و بەردەکانی بناغەی وەك پەنجەکانی دەست ڕیزبەند کراون، (ئیبن زوبێر) پەنجا پیاوی بانگ کردن و کردنی بە شایەد لەسەر ئەمە، کە (حیجر)یش لە چوارچێوەی (بەیت)دا بووە و کاتی خۆی بەجێیان هێشتووە ئینجا (بەیت)ی بینا کردەوە و (حیجر)یشی خستەوە نێو چوارچێوەی سنووری بەیتەوە.[٢]

لە باری تەختانیەوە دوو دەرگای بۆ (بیت) دانان، دەرگایەك بۆ پێداچوونە ژوورەوە و ئەوەی تریش بۆ پێدا هاتنە دەرەوە، بەردە ڕەشەکە چونکە درزی دابوو بە زیو قایمی کردەوە و بە دەستی خۆی لە شوێنی خۆی دانایەوە، پانتاییەکەی لە (١٧) باسکەوە (٢٧) باسك فراوان کرد، دیوارەکانی (کەعبە)ی بە میسك سواخ دا، پۆشاکی (دیباج)ی بە بەردا کرد، ئینجا چووە مزگەوتی عائیشە لە (تەنعیم) ئیحرامی عومرەی بەست، تەوافی (بەیت)ی کرد و نوێژی لە لای مەقامی ئیبراهیم کرد و سەعی سەفا و مەروەی ئەنجامدا، ئینجا پاکسازی تەواوی (بەیت) و دەوروبەری کرد و هەرچی دار و بەرد و خاشاك و خوێنی وشکهەڵاتووی پاشماوەی شەڕ هەبوو هەمووی فڕێدایە دەرەوە، چونکە بە هۆی بەردبارانی مەنجەنیقەوە دیوارەکانی (کەعبە) لە سەرێڕا بۆ خوارێ داتەپابوون و شلۆڕ ببوونەوە و بە دوکەڵ ڕەشهەڵاتبوون و بەردەڕەشەکەش لە نێو ئاگردا درزی دابوو.

هۆی نۆژەن کردنەوەی بیانی (کەعبە) لە لایەن (ئیبن زوبێر)ەوە لە نێو دوو کتێبە(صحیح)ەکەی بوخاری و موسلیم و کتێبەکانی (مەسنەد و سونەن)دا دەست دەکەوێت، لە چەند ڕێبازێکەوە لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ((لولا حدثان قومك بكفر، لنقضت الكعبة،

---

١ـ شذرات الذهب (٣٠٩/١).

٢ـ البداية والنهاية (٦٩٢/١١).

ولأدخلت فيها الحجر فان قومك قصرت بهم النفقة ، وجعلت لها باباً شرقيا و باباً غربياً يدخل الناس من احدهما، ويخرجون من الأخر، ولألصقت بابها بالارض، فإن قومك رفعوا بابها، ليُدخلوا من شاؤوا ويمنعوا من شاؤوا))،[1] واتە: ئەگەر هۆزەكەت لە سەردەمی نەفامی نزیك نەدەبوون، كەعبەم دەڕووخاند، (حیجر)م دەخستە نێو چوارچێوەی كەعبەوە، چونكە هۆزەكەت بەهۆی كەم دەرامەتیەوە لێیان كەم كردۆتەوە دەرگایەكم لە لای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ دەكردەوە و دەرگایەكی تریشم لە لای ڕۆژئاواوە بۆ دەكردەوە، تا خەڵك بە یەكیاندا بچنە ژوورەوە و بە دەرگاكەی تریشدا چووبانایە دەرەوە، دەرگاكەیشم دەهێنایەوە سەر تەختی زەوی، چونكە هۆزەكەت دەرگاكەیان بەرز كردبۆوە تا بە ئارەزووی خۆیان كێیان پێ خۆش بێت ڕێی بدەن بچێتە ژوورەوە و بۆ كێشیان پێ ناخۆش بێت ڕێگای پێ نەدەن.

(ئیبن زوبێر) بە گوێرەی ئەم فەرموودە پیرۆزە كە لە عائیشەی پووریەوە وەری گرتبوو (كەعبە)ی بینا كردەوە، خودا پاداشتی خێری بۆ بنووسێت.

ساڵی(٧٣)ی كۆچی حەجاج كۆتایی بە (ئیبن زوبێر) و دەسەڵاتەكەی هێنا و كوشتی و هەڵی واسی، پاشان دیواری لای باری سەرەوەی هەڵوەشاندەوە و (حیجر)ی لە (بەیت) جودا كردەوە، وەكو پێشدا، بەردە زیادەكانی بردنە نێو كەعبەوە و سەقفەی كردن، دەرگاكەی بردەوە شوێنی خۆی و بەرزی كردەوە، دەرگای لای خۆرئاوای لابرد و شوێنەكەی قەپات كرد، تا ئێستاش هەر بەم شێوەیەیە، ئەم كارەی حەجاج ئەنجامیدا بە فەرمانی عبدالملك بوو، چونكە فەرموودە پیرۆزەكەی پێ نەگەیشتبوو، كاتێكیش فەرموودەكەیان بۆ خوێندەوە، گوتی: خۆزگە وازمان لە(ئیبن زوبێر)و ئەو كارانەی هێنابا كە بە ئەنجامی گەیاندن و سەرپەرشتی كردوون.[2]

---

١ـ البخاري، رقم (١٥٨٣، ٤٤٨٤).

٢ـ البداية والنهاية (١١/٦٩٣).

## سێیەم: هۆکارەکانی ڕووخانی خیلافەتی (ئیبن زوبێر).

لە کاتی خوێندنەوە و توێژینەوەی ئەم بابەتەدا چەند هۆکارێك خۆ زەق دەکەنەوە کە لە پشت ڕووخانی خیلافەتی (ئیبن زوبێر) و سەرکەوتنی (ئومەوییەکانەوە) بوون، گرنگترین ئەم هۆکارانە:

### ١ ــ ئیبن زوبێر (حیجاز)ی کردبووە مەڵبەندی خیلافەت:

ژمارەیەك لێکۆڵەر[1] یەك دەنگن لەسەر ئەمە کە گەورەترین هۆی ئاوابوونی ئەستێرەی دەسەڵاتی ئیبن زوبێر مانەوەی بوو لە (مەککە)دا،[2] ئەگەرچی لە سەرەتای بزوتنەوەکەیدا ڕووی کردۆتە (مەککە) و بەڵگەی بە دەستەوە بوون،[3] بەڵام سووربوونی لەسەر مانەوە لە (مەککە) و کردنی بە بارەگای (خیلافەت)، لە بەرژەوەندی ئەودا نەبوو، چونکە (حیجاز) بە گشتی و (مەککە) بە تایبەتی بە شوێنێکی گونجاو دانانرێت بکرێتە مەڵبەندی دەوڵەتێکی گەورەی وا پەلی بۆ هەموو لایەك هاویشتبێت، (مەککە) دوای کۆچی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵە بەڕێزەکانی دەوری سیاسی خۆی لە دەست دا، و دەورە سیاسیەکە بۆ (مەدینە) گوازرایەوە و تا کۆتایی خیلافەتی عوسمان بەردەوام بوو، کاتێکیش ئاشوب بە شەهیدکرانی عوسمانی خەلیفە سەری هەڵدا، عەلی کوڕی ئەبو تالیب چووە (عێراق) و (کوفە)ی کردە پایەختی (خیلافەت)، ئینجا (معاویە) دوای وازهێنانی خیلافەت بۆ ئەوە لە لایەن حەسەنی کوڕی عەلیەوە لە شام (دیمەشق)ی کردە پایتەختی خۆی، پاشان دەورە سیاسیەکە بۆ حیجاز بە تایبەت (مەککە و مەدینە) نەگەڕایەوە، دەکرێت کارتێکەرەکانی مانەوەی ئیبن زوبێر لە (مەککە)دا لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:

#### أ ـ شوێن:

مەککە وەك زانراوە لە ڕووی شوێنی جوگرافیەوە لە (شام) و (عێراق) دوورە،

---

١ـ وەکو (ناور، قبلان، خراشي) و هی تریش.

٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٣).

٣ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٣).

ئەم دوو هەرێمە گرنگترین قۆناغەکانی ململانێی نێوان (ئیبن زوبێر) و (بەنی ئومەییە)یان بە خۆوە بینی، ئەم دوورە دەستە دەرفەتی بە (ئیبن زوبێر) نەدا ئاگاداری ڕووداوەکان بێت و چاودێری ململانێی نێوان سوپای خۆی و سوپای دوژمن بکات و پەیوەندی بەردەوامی بە شوێنکەوتووانیەوە هەبێت، بەڵکو لایەنی پەیوەندی و هەواڵگری زۆر بێهێز بووە، بەم شێوەیە (ئیبن زوبێر) نەیدەتوانی بڕیاری گونجاو و پڕ بەپێستی ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی دەربکات. لە لایەکی تریشەوە ئومەوییەکان ڕێك بە پێچەوانەوەی ئەوەوە، خودی خۆیان ڕاستەوخۆ لە نێو ڕووداوەکاندا دەژیان، شاری (مەککە)ش دەکەوێتە نێو دۆڵێکی گەمارۆدرا و بە ژمارەیەك چیا و لوتکەی بەرزن شێوەی ئەمە شێوەی نێچیرێکە پەنای بۆ ئەو دۆڵە بردووە و ڕاوچیانی دەوری دەدان و ڕێگاکانی دەرچوون و بە هاوارەوە چوونی لێ دەگرن، بینیمان ساڵی (٦٤)ی کۆچی کاتێك (حەسینی کوڕی نەمیر) گەمارۆی (مەککە)ی دا، خەریك بوو (بزوتنەوەکەی ئیبن زوبێر)بە تەواوەتی بفەوتێ، بەڵام مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە) بووە هۆی کشانەوەی ئەم سوپایە و بزوتنەوەکەش لە لەنێوچوون ڕزگاری بوو.

**ب ـ لایەنی ئابووری:**

(حیجز) بەگشتی و (مەککە)ش بە تایبەتی بۆ داهاتی ئابووری و خورد و خۆراك پشتی بە داهاتی وڵاتانی دەوروبەری دەبەست، بە تایبەتی وڵاتی (شام و میسر)، گیرانی ڕێگەکانی ئەم داهات و خۆراکەش دەبووە هۆی پەیدابوونی قات و قڕی و برسیایەتی و شپرزەبوونی دانیشتوانەکەی، (بەنو ئومەییە) لە کاتی ململانێیان لەگەڵ (ئیبن زوبێر)دا زۆریان سوود لەم هۆکارە وەرگرت، هەر دوابەدوای گرتنەوەی (شام و میسر) ڕێگەیان لەو هاریکاریانە گرت کە بۆ شاری مەدینە دەنێرران،[1] بەشێوەیەکی سروشتی (مەدینە) تووشی چ بێت، (مەککە)ش تووشی ئەوە دەبێت، لە هەردوو گەمارۆی یەکەم و دووەمدا ئەم چەککەیان بەکارهێنا و[2] گەمارۆی ئابووریان خستە سەر حیجاز بە گشتی و (مەککە) بە تایبەتی.

---

١ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٢١٨)، عبدالله بن الزبير (ص: ١٩٤).

٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٤).

ج ــ هێزی مرۆیی:

بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری هۆزەکانی بە دوای خۆدا هێنا بەرەو ولاتە فەتح کراوەکان، بەتایبەتی عێراق و میسر و شام[١]، ئەمە بووە هۆی لاسەنگی تا تەرازوی دابەشبوونی دنیشتوان لە نێوان عێراق و شام لە لایەك و حیجاز لە لایەکی ترەوە، حیجاز بە دەست کەمی کادیر و هێزی مرۆییەوە دەینالاند، لەواقیعدا هەر ئەم کەم و کورپیە نەیهێشت ئیبن زوبێر سوپایەکی گەورە و بە هێزی وا دروست بکات. کە هەمیشە ئامادە و لە سەر پێ بێت و هەر کاتێك بیەوێ پەلاماری دوژمنی پێ بدات و بەرگری لە خۆ بکات، بۆیە دەبینین لە کاتێکدا هێرش دەکرێنە سەر حیجاز و (مەکە)، (ئیبن زوبێر) هەمیشە داوای بە هاوارەوەچوون دەکات لە عێراقەوە بیگاتێ، بەم شێوازە (ئیبن زوبێر) جولانەوەکانی خۆی بە عێراقەوە دەبەستێتەوە، ئەویش بەگوێرەی هێمن بوونی بارودۆخی ئەوێ و ئامادەباشی والیەکەی تا بە هاواریەوە بچێت، بەمەش هەولّ و تەقەلایەکی زۆر لەدەست (ئیبن زوبێر) بە فیڕۆ دەچوو.[٢]

## ٢ ــ سیاسەتی لە بەڕێوەبەرایەتی و دارایی دا:

ئەگەر چی (ئیبن زوبێر) لە دیاری کردنی چەند والیەکدا سەرکەوتوو بووبێ، لە هەموو حالّەتەکاندا ئەم سەرکەوتنەی بە دەست نەهێناوە، دیارە جێگیر بوونی لە (حیجان)دا و نەگەڕانی بەسەر هەرێمە ئیسلامیەکاندا، دەرفەتیان نەدایە تا دانیشتوانی ئەو هەرێمانە لە ڕووی تەبیات و بۆ چوونیاوە بناسێت، وێنەیەکی داب و نەریت و حالّەتی دەرونیان بکێشێت و والی گونجاویان بە سەرەوە دابمەزرێنێت، لەوانە زەقترین وێنە بۆ جێگیرنەبوونی حوکمڕانی (ئیبن زوبێر) لەم بوارەدا هەرێمی (عێراق) بێت بە هەردوك شاری (بەسرە و کوفە)یەوە، عێراق لەو سەردەمەدا

---

١ ـ هجرة القبائل العربية الى البلاد المفتوحة، للعلي (ص: ٢٢، ٥٧).
٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٥).

مەڵبەندی چەندین هۆز و تایەفە و بزووتنەوەی سیاسی و عەقیدەیی و مەزهەبی جۆراوجۆر بوو، پێویستی بە والیەکی کامڵ و سیاسی و ژیری وابوو بتوانێ ئەمانە لە ژێر باڵی ئیدارەکەی خۆیدا کۆبکاتەوە و ڕێکیان بخات و ئاراستەیان بکات، ئەگەر تەماشایەکی ژیاننامە و هەڵوێستەکەی والیەکانی (ئیبن زوبێر) بکەین لە عێراقدا ئەم لاوازیەیان لەڕووی ئیدارەوە پێوە دەبینین و خودی خۆیان بوونەتە هۆی جێ پێ لێژبوونی حاڵتە سیاسیەکە، یەك لەوالیەکانی (ئیبن زوبێر) لەعێراقدا عبدالله ی کوری موتیعی عەدەوی بوو بەسەر (کوفە)وە، کە نەیتوانی بەرەنگاری موختاری ئەبی عوبێدەی سەقەفی بێتەوە و لە بەرامبەریدا بەزی و (کوفە)ی بەجێهێشت[١] بەشێوەیەکی گشتی والیەکانی (ئیبن زوبێر) نەیانتوانی زەبت و ڕەبتی ئەم هەرێمە بکەن کە بە گەورەترین سەرچاوەی هێزی ماڵی و مرۆی و دەوڵەتەکەی دەژمێررا لە ڕووبەڕوونەوەیدا لەگەڵ ئومەویەکان، ئەم خراپ بەڕێوەبردنەی عێراق هۆیەکی ڕاستەوخۆی ڕوخانی خیلافەتی (ئیبن زوبێر) بووە ئەمە کاتێك دەرکەوت کە خەڵکەکەی ژێربەژێر لە دژی موسعەبی کوری زوبێر پەیوەندیان بە ئومەویەکانەوە کرد بەڵام دەربارەی پەیوەندی (ئیبن زوبێر) بەوالیەکانیەوە: وەك دبینرێت ئەو هەر والیەکی لە هەر هەرێمێك دانابایە. ئەوا هەرێمەکەی لە هەموو بوارەکانی بەڕێوەبردنەوە تا بە بواری شەڕکردن و سەربازیش دەگات بە خودی والیەکە دەسپارد، ئەو دەستی نەدەخستە کار و باری والیەکانی، وەك دەڵێن خەریك بوو پەیوەندی بە هەندێکیانەوە بپچرێت، ئەم سستی پەیوەندیە بووە هۆی خێرا گیرانی ئەو هەرێمانە لە لایەن ئومەویەکانەوە، گیرانی (قرقیسیا) بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەمە، زوفەری کوری حاریسی کیلابی والی ئەو هەرێمە بوو، ماوەی چەند ساڵێك لە بەرامبەر عبدالملك وەستایەوە و جەنگا، ڕێگای دەرچوونی بەرەو عێراقی لێ گیرا، ماوەیەکی زۆری خایاند هیمدادی نەگەیشتێ، (ئیبن زوبێر) هێزی بە هاوارەوە نەنارد، لە کۆتاییدا و بە ناچاری خۆی بە دەستەوە دا و چووە ژێر باڵی دەسەڵاتی

---

١ ـ الطبقات (١٤٨/٥).

عبدالملكی كوڕی مەروانەوە، دوای ئەوەی هوزەیلی كوڕی زوفەر (زوفەر)ی بابی خستە سەر ئەو باوەڕەی كە عبدالملك لە (ئیبن زوبێر) باشتر دەبێ لە بەرامبەریاندا.[١]

بەڵام دەربارەی سیاسەتی ئابووری (ئیبن زوبێر)، وێڕای كەمی داهاتی ئابووری ئەو، تێبینی دەكرێت لە بۆچوونەكانیدا سەبارەت بەو ماڵ و سامانەی لەبەر دەستیدایە، كاریگەری خەلیفە ڕاشیدەكانی لەسەر بووە، بە تایبەتی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەیەویست لە ڕووی بەخشینەوە شوێن پێی ڕێبازی ئەوان هەڵبگرێت، پێی وابوو بەیتولماڵە: ماڵی خوایە، مافی موسڵمانانە، بەكارهێنانی لە ڕووی شەرعیەكەیەوە نەبێت دروست نیە، زۆر داكۆكی لەم بۆچوونانە دەكرد، ئەم سیاسەتە لەو كاتەدا نەدەچووە مێشكی زۆربەی خەڵكەوە، چونكە (خەڵك) وەك د. العش دەڵێ: توانایان نەبوو لەم سیاسەتە بگەن و هەزمی بكەن.[٢]

(ئیبن زوبێر) بەیتولماڵەی نەكردە ئامرازێك، بۆ داكوتانی پایەكانی دەوڵەتەكەی و ڕاكێشانی خەڵكی ئازا و شارەزا و كارامە لە دەورەی خۆی و سەرخستنی پڕۆژەی شوراكەی و بەهێزكردنی هێزەكانی لە ڕووی چەك و چۆڵەوە، بە شێوەیەكی ئاسایی ژمارەیەكی باشی لە پشتیوانانی خۆی لە دەستدان، لە كاتێكدا زانیمان (ئومەوییەكان) ماڵ و سامانی گشتیان بەسەر سەرۆك هۆز و كەسانی دیار و شاعیراندا هەڵدەڕشت تا بە لای خۆیاندا ڕایانكێشن.

## ٣ ـ بەخۆنەگرتنی سەرۆك هۆزەكانی عێراق:

حوكمڕانان دەتوانن زۆربەی سەرۆك هۆزەكان بە ماڵ و سامان و بەخشین بە لای خۆیاندا ڕابكێشن، چونكە چەكی ماڵ و سامان ترسناكە و كاریگەرە و دڵان كەمەندكێش دەكات و كار لە دڵ و دەروون دەكات، گێڕدراوەتەوە: موسعەبی كوڕی زوبێر) دوابەدوای كۆتایی هێنان بە موختار و كوشتنی، بە خۆی و سەرۆك

١ ـ انساب الاشراف (٥/٣٠٥).
٢ ـ الدولة الاموية (ص: ٢٠٧).

هۆزەکانی عێراقەوە دەچێتە (مەککە) و سەردانی (ئیبن زوبێر) دەکەن، موسعەب دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران، لەگەڵ سەرۆك هۆز و پیاوماقوڵانی عێراق هاتوومە خزمەتتان، هەر یەکێك لەم پیاوانە لە نێو هۆزەکەی خۆیدا برا گەورەیە و پەیڕەوی لێ دەکرێت، ئەم پیاوانە ئەو کەسانەن کە بە پەلە و بێ دواکەوتن بەیعەتیان بە جەنابتان دا، ژیانیان بە بانگەشەی تۆ بەخشی، سەرپێچی کەرانی تۆیان لە ناو برد، هەوڵیان داوە و دەدەن دوژمنەکەت بنبڕ بکەن، تکایە لەو ماڵ و سامانە بەخشیشیان پێ بدەن، عبدالله ی کوڕی زوبێر گوتی: بەخۆت و کۆیلەکانی عێراق هاتوویتە لام، فەرمانم پێ دەکەی لە ماڵی خودا بیاندەمێ؟! کاری ئاوا ناکەم، سوێند بە خوا حەزم دەکرد ئاڵوگۆڕم پێ کردبان چۆن ئاڵوگۆڕی دینار بە درهەم دەکرێت، (١) نەفەرم لە ئەمانە دەدا بە یەك نەفەری شام.[١]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (أبو حاضر الأسدي)ی قازی بەسرە گوتی: پەندێك هەیە بۆ ئێمە و بۆ ئێوە ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەویش ئەو دێڕە شیعرەی (أعشی)یە:

علقناک عرضاً وعلقت رجلاً...غیري وعلق أخری غیرها الرجل

ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئێمە خۆمان بە تۆوە بەستۆتەوە و تۆش دڵت بە خەڵکی شامەوەیە، خۆ خەڵکی شام خۆیان بە (مەروان)ەوە بەستۆتەوە، ئێستا ئێمە چی بکەین؟!

شعبی دەڵێ: هیچ وەڵامێم وەك ئەو وەڵامە جوان و پڕ بەپێستە نەبیستووە!،[٢] پاش ئەمە ئیبن زوبێریان لێخست و نامەیان بۆ عبدالملك نووسی کە: بەرەو لامان وەرە[٣] بۆ عێراق.

---

١ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي (ص: ٥٠٦).
٢ـ البداية والنهاية (١١/١٤٦، ١٤٧).
٣ـ العالم الاسلامي في العصر الاموي (ص: ٥٠٦).

## ٤ــ بەيعەت پێ نەدانی لە لایەن (بەنی هاشم) و دژایەتی کردنی دەوڵەتەکەی:

عبداللە ی کوڕی عەباس و محەمدی کوڕی عەلی ناسراو بە ئیبن لحەنەفییە و چەندین کەسایەتی تری بەنی هاشم بەیعەتیان بە (ئیبن زوبێر) نەدا، ئەویش بە نەرم و نیانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەکردن، بەڵکو جاروبار توند و تیژیشی لە دژ بەکاردێنان.[١]

## ٥ــ زێدەڕۆیی موسعەبی برای لە خوێن ڕێژیدا دوای کۆتاییهێنان بە موختار:

موسعەب هاتە لای (ئیبن عومەر) و سەلامی لێکرد و گوتی: تۆ کێی؟ گوتی: من برازاکەتم، موسعەبی کوڕی زوبێر گوتی: والی عێراق؟ گوتی: بەڵێ، ئینجا بە (ئیبن عومەر)ی گوت: پرسیارت لێ دەکەم دەربارەی خەڵکێك: دوژمنایەتیان کرد و لە فەرمان دەرچوون و شەڕیان کرد و تا کاتێك شکستیان خوارد، ئینجا چوونە نێو قەڵایەکەوە، خۆیان تێدا مەڵاسدا و داوای ئەمانیان کرد تا نەکوژرێن، ئەمانیان پێدرا بەڵام دوایە کوژران؟

(ئیبن عومەر) گوتی: ئەی موسعەب: ئەگەر مرۆڤێك لای بەرەبەیانیەك بکەوێتە نێو ئاژەڵی (زوبێر)ەوە و (٥) هەزار مەڕ سەربڕی، تۆ ئەو کەسە بە (زێدەڕۆ) نازانی؟ وەڵامم بدەوە. گوتی: بەڵێ، کەسێك لە ڕۆژێکدا پێنج هەزار مەڕ سەر ببڕێت، من بە (زێدەڕۆ)ی دادەنێم، ئیبن عومەر گوتی: بۆ ئاژەڵی بە زێدەڕۆ دەزانی بەڵام بۆ مرۆڤی بە زێدەڕۆ نازانی؟ باشە تۆ خودا ناپەرستی لێی ناترسی؟ نازانی خودا چ زاتێکی بە سامە؟ کەسانێکت کوشتووە خودایان بە یەك دەزانی! ئایا تێیاندا نەبوو بە زۆر پێکرابوو و تۆبە لە تاوانەکەی دەگێڕایەوە، یان هەموویان بوو

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، مروج الذهب (٣/٨٥ ـ٨٦).

نەفام بووە و ئومێدی گەڕانەوەی لێ دەکرا.[١]

ئەو کوشتارە زۆرەی موسعەب لە عێراق ئەنجامیدا دڵ و دەروونی عێراقیەکانی پڕکرد لە توڕەیی و ڕق و تۆڵە، پێ دەچێت ئەو هەڵوێستەی عێراقیەکان لە جەنگی (دێر جالسیق) بەرامبەر بە موسعەب نواندیان پەیوەندی بە ئەمەوە هەبووبێت، ئەو کەسەی موسعەبی کوشت (زیادی کوڕی زوبیان) بوو، کاتێك چووە لای عبدالملك ، فەرمانیدا هەزار دیناری زێڕی بەخشیش پێ بدەن، بەڵام (زیاد) ئەم بەخشیشەی ڕەت کردەوە و هیچی وەرنەگرت و بە (عبدالملك)ی گوت: من بە فەرمانی تۆ و لەسەر داوای تۆ نەمکوشتووە، بەڵکو لە تۆڵەی (نابی) برامدا کوشتوومەتەوە.[٢]

گوتراویشە: (زایدەی کوڕی قودامەی سەقەفی) بەشداری کوشتنی موسعەبی کردووە و کاتێك کوشتوویەتی گوتوویەتی: هاوار بۆ تۆ لە سێنانی موختار![٣]

## ٦ـ بە کەم دانانی دەسەڵاتی ئومەوی لە لایەن (ئیبن زوبێر)ەوە:

دەبوایە (ئیبن زوبێر) نەیهێڵابا ئومەویەکان دوای مردنی یەزید لە (مەدینە) دەرچووبان و بەرەو شام ڕۆیشتبان، بە تایبەتی (مەڕوانی کوڕی حەکەم) و (عبدالملك)ی کوڕی، ئەگەر (ئیبن زوبێر) پشتگیری ئەم کۆچەی کردبان ئومەویەکان کەسێکیان دەست نەدەکەوت لە پەرتەوازەیی ڕزگاریان بکات و ڕیزەکانیان ڕێك بخاتەوە و دەسەڵاتیان بۆ بگێڕێتەوە، (مەڕوانی کوڕی حەکەم) تا نەگەیشتە شام بیری لە حوکمڕانی نەکردبۆوە، لە لایەکی تریشەوە (عبدالله ی کوڕی زوبێر) وەك پێویست پشتیوانانی خۆی لە شام نەدەکرد و بە جیددی گرنگی بە ئەوێ نەدا، کە دەبوایە لەم ساتەوەختەدا بە خۆی و سوپایەکی گەورە و بەهێزەوە بەرەو شام بچێت و پاشماوەی دەسەڵاتی ئومەوی لە ڕەگەوە دەرکێشێت.

---

١ـ مصنف ابن ابي شيبة (١٥/٨٥).

٢ـ الكامل في التاريخ (٣/٥٤).

٣ـ الكامل في التاريخ (٣/٥٤).

## ٧ ـ گوێ نەدانی بە لایەنی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندە:

واتە بایەخی بە شاعیران نەدەدا و بە پێشکەش کردنی بەخشیش و دیاری مەستی نەکردن، ڕاستە دەستە شاعیرێك خۆبەخشانە بە شیعرەکانیان پشتگیری عبدالله و بانگەوازەکەی ئەویان کردووە، بەڵام زۆربەی شاعیران بەبێ بەرامبەر ئەم کارە ناکەن کە لە بانگەسەکان لە لایەن ئەوانەوە ڕەواجیان پێ دەدرێت:

عوبەیدەی کوڕی قەیسی ڕوقییات[1] لە ستایشی عبدالله دا گوتوویەتی:

أنـت ابـن معتلـج البطـاح     كَـدَدِّها فكـدائها
فالبيـت ذي الأركـان     فامستن مـن يطحائهـا

تا ئەو شوێنەی دەڵێ:

ولـدت أعـزّ مباركـاً     كالبـدر وسـط سـكائها
فى ليلـة لا نحـس فيـه     سـحريها وعـشائها
ان الـبلاد سـوى بـلادک     ضـاق عـرض فـصائحها
فـاجمع بـنى الى بنيـک     فانـت خـير رعائهـا
نـشهدک منـا مـشهداً     ضـنكاً علـى أعـدائها
نحـن الفـوارس مـن قـريش     يـوم جـد لقائهـا[2]

ئومەویەکان لە گۆڕەپانەکانی جەنگی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی لەگەڵ عبدالله دا سەرکەوتنی گەورەیان بە دەست هێنان، ئەوان سەروەت و سامان و پول و پارەیەکی زۆر و زەوەندیان دەکردە شاباشی شاعیران، بۆیە دەبینین شاعیرەکانیان بە کەیفی خۆیان بە بەژن و باڵای ئومەویەکانیان هەڵدەگوت و تانە و تاشەری خراپیشیان لە عبدالله دەدان، تەماشاکەن چۆن أعشی ی کوڕی ربیعەی شاعیری

---

١ـ ديوان عبيدالله بن قيس، تحقيق محمد يوسف (ص: ١١٧).
٢ـ موقف الشعر من الحركة الزبيرية (ص: ٢٦).

ئومەوی تانە و تەشەر لە عبدالله دەدات:

آل الزبير من الخلافة كالتي عجل النتاج بجملها فأحالها
أو كالضعاف من الحمولة حُملت مالا تطيق فضيعت أحمالها
قوموا اليهم لاتناموا عنمه كم للغواة أطلتم امهالها
ان الخلافة فيكم لا فيهم مازلتم أركانها وثمالها
أمسوا على المعروف مغلقاً فانهض يمينك فافتح أقفالها[1]

## ٨ ـ بەکارهێنانی لێدان و توند و تیژی زیاد لەگەڵ عەمری برای:

شێوازی لەنێو بردنی عەمری کوڕی زوبێر لە لایەن عبدالله ی کوڕی زوبێرەوە و دوای بە دیلگرتنی، کاردانەوەی خراپی لێکەوتەوە بۆ سەر خودی عبدالله، وای لە خەڵك کرد بە پیاوێکی بێ سۆز و بەزەیی تەماشای بکەن، و لەمەولا هاوسۆزییان نەبێت لەگەڵ کێشەیەکدا.

عەمری کوڕی زوبێر بە تۆمەتی هاوسۆزی و پشتیوانیان لەگەڵ عبدالله ی کوڕی زوبێر لە مەدینە لە خەڵکی دەدا، ئەم کارەی لە لایەن دەوڵەتەکەیەوە پێ سپێردرابوو، کەواتە ئەمە بەرهەمی تەبیعی و سروشتی پۆستەکەی بوو، هەرچەندە حاشا لە تاوان و ستەم و غەڵەتی خودی خۆشی ناکرێت، بۆیە زۆربەی خەڵك خۆزگەیان دەخواست عبدالله عەمری بەندکردبایە و بەس، یان داوای لەو کەسانە کردبایە کە عەمر سزای داون چاوپۆشی لێ بکەن و لە هەڵەکانی ببوورن،[2] هەندێکیش پێیان وایە عبدالله تەنها خوازیاری کورسی دەسەڵات بوو، دەنا ئاوا دڵڕەقانە و بێ ڕەحمانە لە بەرامبەر براکەی هەڵسوکەوتی نەدەکرد،[3] شاعیرانی دوژمنی ئەم ڕووداوەیانم بە سوودی خۆیان و ئومەوییەکان شکاندەوە، تەماشا چۆن زوحاکی کوڕی فەیروزی دەیلەمی گاڵتە بە عبدالله و بانگەوازی دنیا نەویستی و

---

١ـ موقف الشعر من الحركة الزبيرية (ص: ٨٧).
٢ ـ موقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٥٣٥).
٣ ـ موقف المعارضة في خلافة يزيد (ص: ٥٣٥).

چاکسازیەکەی دەکات و دەڵێ:

تخبرنا ان تكفيك قبضة    وبطنك شبر أو أقل من الشبر
وانت إذا نلت شيئاً قضمته    كما قضمت نار الغضا حطب السرر
فلو كنت تجزي أو تبيت بنعمة    قريباً لردتك العطوف على عمرو[1]

عبداللە ی کوڕی زوبێری ئەسەدی)ی شاعیری ئومەوییش بەم شێوەیە بەسەر عبداللە و بانگەوازەکەیدا دەیکا بە هەرا:

تحدث من لاقيت انك عائذ    مصرعت قتلي بين زمزم وركن
قتلتم اخاكم بالسياط سفاهة    فيالك للرأي المشلل والأمن[2]

تا ئەو شوێنەی دەڵێ:

قطعت من الأرحام ما كان واشجا    على الشيب واتبغت المخافة[3]

## ٩ـ باڵادەستی دوژمنانی عبداللە :

جێی سەرسوڕمان نیە تاقمی (بەنی ئومەییە) باڵادەستتر و دەست ڕۆیشتووتر بن، لە بواری ئیدارە و بەڕێوەبردندا لە عبداللە ی کوڕی زوبێر، (بەنو ئومەییە) لە سەردەمی (معاویە) وە پۆستی حوکمڕانیان وەرگرت و شارەزای هونەری بەڕێوەبردن بوون، بەڵام عبداللە ی کوڕی زوبێر لەم بوارەدا تازە بوو و تەنانەت سەرقاڵیەکان نەیانهێشت بە خودی خۆی سەرپەرشتی هەرێمێك لە هەرێمەکانی دەوڵەتە دەوڵەتە فراوانەکەی بکات، هەروەها لە بواری سەربازیشدا: هەست دەکەین (بەنو ئومەییە) لە تاکتیکی جەنگی و سەرکردایەتی کردنی سوپادا زۆر لە عبداللە

١ ـ الحرب الزبيري في ادب العصر الاموي، ثريا ملحس (ص: ٢٢٥).
٢ ـ هەمان سەرچاوە (ص:٢٢٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە (ص:٢٢٨).

دەست ڕۆیشتووتر و شارەزاترن، زەقترین بەڵگەی ئەم قسەیەمان ئەوەیە: تەماشا دەکەین مەڕوانی کوڕی حەکەم خودی خۆی سەرکردایەتی ئەو سوپایەی کرد کە هێرشی کردە سەر وڵاتی (میسر)و لە ژێر پێی والی عبدالله ی هێنایە دەرەوە و خستیەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئومەویەوە، ئینجا دوای ئەمە (عبدالملك)ی کوڕی دەکاتە سەرکردەی ئەو سوپایەی کە بۆ جەنگی عێراق دەنێرێ، بەم کارەیان دەیان بینی ڕاستەوخۆ چ شتێك لە گۆڕەپانی ڕووداوەکاندا دێتە ئاراوە و لە لایەکی تریشەوە لایەنی دەروونی و مەعنەوی هێزە هێرش بەرەکە نەدەڕووخا و بەرز دەبۆوە.

لە بەرامبەریشدا دەبینین عبدالله ی کوڕی زوبێر خۆی لە (مەککە) دەمێنێتەوە و بۆ پێکانی ئامانجەکانی و بە دەستهێنانی سەرکەوتنەکانی جەنگ پشت بە سەرکردەی سوپاکان، یان والی هەرێمەکانی دەبەستێت، عبدالملك ڕەخنە لەم سیاسەتەی عبدالله دەگرێت و دەڵێ: ئەگەر عبدالله ی کوڕی زوبێر خەلیفە بووایە وەك خۆی گوتوویەتی خۆی دەردەخست و خودی خۆی سەرکردایەتی پشتیوانەکانی دەکرد و کلکی خۆی لە حەرەم نەدەچەقاند.[1]
وەك دەکرێ: ئەم جەنگ و ململانێیانە دەکرێت دەبینین: (بەنو ئومەییە) هەمیشە لایەنی هێرشبەر و پەلاماردەر بوون، عبدالله ی کوڕی زوبێریش هەمیشە لە سەنگەری بەرگری و بەرەنگاریدا بووە.[2]

## ١٠ــ کەش و هەوا و زەمینەی پەیدابوونی بزوتنەوەی ( عبدالله ی کوڕی زوبێر ):

ئەگەر بە ویژدانەوە قسە بکەین، دەبێ بڵێین: ئەو بارودۆخە ناسازەی بزوتنەوەکەی عبدالله ی لە خۆگرتبوو بە هۆکاری هەرەگەورەی ڕووخانی خیلافەتەکەی دادەنرێت، چونکە لەم سەردەمەدا چەندین بزووتنەوەی مەزەبی و

١ـ الطبقات (٥/٢٣٢).
٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٩).

